# پوختەیەک لە ژیاننامەی

# پێشەوایان







- سەعیدی نورسی



- ئەبوئەعلای مەودودی



- حەسەن بەننا



- سەیید قوطب



- ئەحمەدی موفتی زادە
- ناصری سوبحانی





هەردی صابر

کۆیکردۆتەوە و ئامادەی کردووە



# پوختەیەك لەژیاننامەی پێشەوایان

سەعیدی نوورسی
ئەبوئەعلای مەودودی
حەسەن بەننا
سەیید قوتب
ئەحمەدی موفتی زادە
ناصری سوبحانی

هەردی صابر
کۆیکردۆتەوە و ئامادەی کردووە



| | |
|---|---|
| ناوی کتێب بەکوردی: | پوختەیەک لەژیاننامەی پێشەوایان |
| ئامادەکردنی: | هەردی صابر |
| بڵاوکردنەوەی: | نوسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن/ هەولێر |
| نەخشەسازی ناوەوە: | مصعب ملا یوسف |
| خەت: | نەوزاد کۆیی |
| بەرگ : | أمین مخلص |
| نۆرە و ساڵی چاپ: | یەکەم ١٤٣٤ك - ٢٠١٣ز |
| تیراژ: | ١٥٠٠ دانە |

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان - ژمارەی سپاردن

(٢٧٩) ساڵی (٢٠١٢) پێدراوە





نوسینگەی تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن
هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر تونێلی شیرین پالاس
Mob:00964 750 460 61 22
Tel: 0964 750 25 18 138
www.tafseer-pub.com
tafseeroffice@yahoo.com




## پێشکەشە :

١) بە ڕۆحی هەر شەش زانای گەورە:

(نورسی و مەودودی و بەننا و سەیید و موفتی زادە و سوبحانی)

٢) بە ڕۆحی هاوڕێ و برای کۆچکردووم (کاك مصطفی) ی خەمزەیی .

٣) بە هەموو ئەوانەی لە پێناو سەرخستنی ئایین و ڕێبازی خواناسین ژیان و گیانیان بەخت کرد .

# پێشەکی :

**إن الحمد لله، نحمده و نستعينه و نستغفره، ونعوذ بالله من شرور أنفسنا وسيئات أعمالنا من يهدى الله فلا مضل له، ومن يضلل فلا هادي له، وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له، وأشهد أن محمداً عبده ورسوله..**

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ﴾ **(آل عمران : ١٢)** ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ﴾ **(النساء : ١)** ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ۞ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ۞ ﴾ **(الأحزاب : ٧٠ – ٧١)**

**أما بعد، فإن أصدق الحديث كتاب الله، وخير الهدي هدي محمد (ﷺ) وشر الأمور محدثاتها، وكل محدثة بدعة، وكل بدعة ضلالة، وكل ضلالة في النار.**

**زۆر خۆم بە بەختەوەر دەزانم کەوا توانیبێتم لەم پوختە ژیاننامەدا ژیانی گەورە پیاوانی مەیدانی بانگەواز و جیهاد و تێکۆشان وەک پێشەوا (سەعیدی نوورسی) و (ئەبوئەعلای مەودودی) و (حەسەن بەننا) و (سەیید قوتب) و (ئەحمەدی موفتی زادە) و (ناصریٔ سوبحانی) بخەمە بەر دیدی موسوڵمانی کورد زمان کە ببێتە هۆی یەکڕیزی و پێکەوە ژیانی موسوڵمانانە و، تێگەیشتنی دروست لە ڕۆحی ئەو پەیامەی کە ئەوان گەیاندوویانەو ژیانی خۆیانیان تێدا بەخت کردووە.**

**وە هەوڵبدەین لەوە تێ بگەین کە ئەو پێشەوا بەرزانە بۆ بڵاوکردنەوەی ئایینی**

خوا و گەیاندنی پەیامی ئیسلام بە مەردوومان تووشی چ زەحمەت و ناڕەحەتی و ئەشکەنجەیەکی زۆر هاتوون تا وردە وردە خەڵکی لە ئیسلام تێ بگەیەنن و بێن بەرەو لای خواپەرستی و شوێنکەوتنی حەق و ڕاستی.. وە هەروەها دەبێ ئەوەمان لە یاد نەچێ کە ئەم زانا بەڕێزانە چ هەوڵێکیان داوە بۆ یەکڕیزی موسوڵمانان و لەناوبردنی جیاوازی و دووبەرەکی نێوانیان و، هەروەها ئاراستە کردنیان بەرەو لای یەکخوا و شوێنکەوتنی پێغەمبەری ئیسلام (ﷺ) و گەڕانەوەیان بۆلای (قورئان و سوننەت) ، ئیتر هەر کامێکیان بەپێی تواناى زانستی خۆی و بەپێی تێگەیشتنی بۆ ئایینی ئیسلام کە ئەمەش ئەگەر بە جوانی تێی بڕوانی هەمووی مایەی ڕەحمەت بووە بۆ موسوڵمانان و بووەتە هۆی پێشخستنی کاری ئیسلامی هەرکەسە لە وڵات و شوێنی خۆیدا..

هەروەها دەمەوێ ئەوە عەرزی خوێنەرانی ئازیز و خۆشەویست بکەم کە ناوهێنان و باس کردنی ئەو پێشەوا بەڕێزانە بەو ڕیزبەندیەی کە هێناومە دەگەڕێتەوە بۆ کات و ساڵی بانگەوازکردنیان کە (پێشەوا نوورسی) لە ڕووی ساڵ و بەروارەوە لە پێشەوەی ئەوانی تردایە و دواتر ( مەودودی و بەننا) یە و پاشان (سەیید) ە و دواتر (کاک ئەحمەد) و (کاک ناصر) ە.

هەر بۆیە نابێ هیچ کەسێ وا تێ بگات کە ئەم ڕیزبەندییە مەبەست و ئامانجێکی تری لە پشتەوەیە و بە نیازێکی تر وا دانراوە، ئێمە تەنها مەبەستمان ڕەزامەندی خوا و ناساندنی کورتەیەك لە ژیاننامەی ئەو پێشەوایانەیە بە موسوڵمانان و خزمەتێك بە بانگەوازەکەیان و هیچی تر..

هەروەها هەوڵمداوە کە بۆ هەر ناو و شوێنێك وێنەی کەسەکە یا شوێنەکە بهێنم بۆ ئەوەی خوێنەرانی بەڕێز باشتر سوود لە بابەتەکە وەربگرن و زیاتر لێی تێ بگەن.

هەروەها پێویستە ئەوەش بڵێم: کە ئەم پیاوە گەورانە بەچی وا گەورەبوون؟ بە چ شتێ ئاوا ناوو ناوبانگیان لەناو خەڵکدا بڵاوبۆتەوە و ڕێزی تایبەتیان بۆ دادەنرێ؟ بێگومان ئەمە هەمووی بەهۆی عیبادەت کردنی خوای تاك و تەنیایە و، گوێڕایەڵ بوون بۆ فەرمانەکان و فەرمایشتەکانی کە قورئانی پیرۆزە و، هەروەها شوێنکەوتنی ڕاست و دروستی پێغەمبەرەکەی (ﷺ) و گوێڕایەڵ بوون بۆ ئامۆژگاری و فەرمایشتەکانی و، وە دوورکەوتنەوە لە گوناهە گەورەکان و ڕەوشتە ناپەسەندەکان کە ئەمانە هەمووی دەبنە هۆی نزیك بوونەوە لە خوا و بەدەست هێنانی خۆشەویستی خوا و پێغەمبەرەکەی (ﷺ) و ڕێزی موسوڵمانان و سەرجەم خەڵکیش..

کەواتە هەموو کەسێ ، هەموو موسوڵمانێ دەتوانێ ئەو ڕێز و حورمەت و گەورەییەی ئەوان بەدەست بهێنێ بە مەرجێ تەنها مەبەستی ڕەزامەندی خوا و شوێنکەوتنی پێغەمبەری خوا بێ (ﷺ) ...

وە داواکارم لە خوای کاربەجێ کە ڕۆحی ئەم پێشەوا و زانا بەڕێزانە بە بەهەشتی بەرین و فیردەوسی بالا شاد بکا و بیانخاتە ژێر ڕەحمەت و سۆزو میهرەبانی خۆیەوە و، هەوڵ و ماندوو بوونیان بە زایە نەچێ و پەیامەکەیان بگاتە بەرهەم... (ئامین .. ئامین) .

**باوکی کەوسەر**

**هەردی صابر**

**(٧) ی ڕەمەزانی ساڵی (١٤٣٣) ی کۆچی**

## پوختەیەك

## لە ژیاننامەی سەعیدی نوورسی



١) ناوی تەواوی و شوێنی لە دایك بوونی

٢) ناوی باوك و دایك و برا و خوشكەكانی

٣) قۆناغەكانی خوێندن و پلەی زانستی و لێهاتوویی

٤) قۆناغەكانی ژیانی سەعید نوورسی

٥) هاوسەرگرتنی سەعید نوورسی

٦) هەڵسوكەوتی مامۆستا نوورسی لەگەڵ كەسانی چواردەوریدا

٧) چاكسازییەكانی مامۆستا نوورسی

٨) ئەو هەواڵەی كە سەرلەبەری مامۆستا نوورسی گۆڕی و پاشان كەوتە هەوڵ و تێكۆشان بۆ بڵاوكردنەوەی پەیامی ئیسلام كە دواتر ناوی دەركرد بە (كۆمەڵی نوور)

٩) دانراوو نووسینەكانی مامۆستا نوورسی

١٠) مێژووی كۆچی دوایی

١١) ئەو خزمەتە نایابانەی كە بە مامۆستا نوورسی كراوە لە دوای وەفات كردنی

١٢) ئەو كتێبانەی كە لەسەر (سەعید نوورسی) نووسراون بە زمانی عەرەبی ، بە زمانی ڕەسەنی كوردیش ئەم بابەتانەی لەسەر نووسراوە

١٣) هەندێ لە وێنەكانی پێشەوا نوورسی

سەرچاوەكانی ئەم ژیاننامەیە

# پوختەیەک
# لە ژیاننامەی پێشەوا سەعیدی نورسی



**١) ناوی تەواوی و شوێنی لە دایك بوونی :**

(سەعید) ی کوڕی سۆفی (میرزا) ی کوڕی (عەلی) یە، لە ساڵی (١٨٧٣) ی زایین بەرامبەر (١٢٩٠) ی کۆچی لە گوندی (نوورسی) سەر بە پارێزگای (بەدلیس) ی کوردستانی تورکیا لە بنەماڵەیەکی کوردی ئایین پەروەر چاوی بە دنیا هەڵهێناوە.



گوندی نوورس

**٢) ناوی باوك و دایك و برا و خوشکەکانی :**

**أ- باوکی :** ناوی سۆفی (میرزا) ی کوڕی (عەلی) کوڕی (خضر) ی کوڕی (میرزا خالید) ی کوڕی (میرزا رشان) ە ، لە عەشیرەتی (إسباریت) ە ، ئەم پیاوە لەبەر خواناسی و زۆر لە خواترسانی ناونراوە بە (سۆفی) ، وا دەگێڕنەوە لێی : کاتێك مەڕو ماڵاتی پێبووە کە لە شوانی دەگەڕایەوە ، دەمی مەڕو ماڵاتەکەی دەبەست، بۆ ئەوەی کشتوکاڵی خەڵکی تر نەخوا [1] .

لە دەوروبەری ساڵەکانی (١٩٢٠ م) دا لە گوندی (نوورس) کۆچی دوایی کردووە و هەر لە گۆڕستانی ئەوێش بە خاك سپێردراوە، وە لەسەر کێلی گۆڕەکەشی نووسراوە (میرزە) .

**ب- دایکی :** ناوی (نووریە کچی مەلا تاهیر) ە و، لە گوندی (بلکان) لە دایك

---

(١) (سعید النورسي– السنة النبوية سنة كونية وحقيقة روحية ، ترجمة : إحسان قاسم الصالحي/ ص ٥) .

بووە کە سێ سەعات لە گوندی (نوورس) ە وە دوورە، وە لە عەشیرەتی (خـاکیف) ە ، کـە هـەردوو عەشـیرەتی خـۆی و مـیرزای مێـردی دەچـنەوە سـەر کوردەکـانی هەکاری.

ج- **خوشکەکانی:** مامۆستا نوورسی سێ خوشـکی هـەبووە ، یەکـەم : (دوریـة) کە دایکی (عوبەید) بووە و لە پێش جەنگی جیهانی یەکەمدا کۆچی دوایی کـردووە، دووەمیان : (خانم) کە ئافرەتێکی زانا بـووە و لـە سـاڵی (١٩٤٥ م) دا لـە مـەوسمی حەجدا لە کاتی تەوافدا کۆچی دوایی کردووە [١] ، وە سێیەمیش (مەرجان) ە کە لـە هەموویان بچووکتر بووە [٢] .

د- **براکانی:** مامۆسـتا نوورسـی سـێ بـرای هـەبووە ئـەویش بریتیـە لـە (مـەلا عبدالله) کە برا گەورەی بووە و، یەکێك بووە لە زانا گەورەکانی کورد لە کوردستانی تورکیـا [٣] ، وە بـاوکی (عبـدالرحمن) ە کـە قوتـابی و منـاڵی مەعنـەوی مامۆسـتا نوورسی بووە. لە ساڵی (١٩١٤ م) دا کۆچی دوایی کردووە [٤] .

هەروەها دووەمیان ناوی (محمد) بووە کە لە مامۆستا بچووکتر بووە ، لە ساڵی (١٩٥١ م) دا کۆچی دوایی کردووە [٥] .

هەروها سێیەمیان ناوی (عبدالمجید) ە کـە بـرا گچـکەی مامۆسـتا بـوو، زۆر لـە پەیامەکانی مامۆستای بۆ زمانی عەرەبی وەرگێـڕاوە، بـەڵام کـاتی خـۆی لـە بـواری

---

(١ ) (الشعاعات / ص ٣٢٢) .

(٢) (سيرة ذاتية للأستاذ سعيد النورسي / ص ٣٦) .

(٣) (أحمد بهجت ــ سعيد النورسي الرجل والدور ، بديع الزمان سعيد النورسـي في مـؤتمر عـالمي حول تجديد الفكر الإسلامي / إستانبول ١٩٩٢ م) .

(٤) (سيرة ذاتية للأستاذ سعيد النورسي / ص ٣٦) .

(٥) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

تەسکدا بڵاوکراونەتەوە و پەیامە عەرەبیەکانیشی (إشارات الإعجاز) و (المثنوي العربي النوري) وەرگێڕا بۆ تورکی، مامۆستای زمانی عەرەبی بووە و، دوای ئەوە موفتی، دوای ئەوەش مامۆستای زانستە ئیسلامیەکان بوو لە پەیمانگای پێش نوێژ و وتاربێژەکان و پەیمانگای ئیسلامی باڵا لە (قۆنیا) .

لە ساڵی (١٩٦٧ م) و لە تەمەنی هەشتا و سێ (٨٣) ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە، بەر ڕەحمەتی بەلێشاوی خوای گەورە بکەوێ [1] .

**کەواتە منداڵەکانی (میرزا عەلی) بەپێی گەورەو بچووکییان بەم جۆرەیە:**

(دوررییە ، خانم ، عبداللە ، سەعید ، محمد ، عبدالمجید ، مەرجان) .

**بەخشینی (ئیجازە عیلمی) لەلایەن مامۆستا نوورسییەوە بە (عبدالمجید) ی برای گچکەی**

مامۆستا (عبدالمجید) ئیجازە نامەی لە مامۆستا نوورسی برا گەورەی وەرگرتووە جا هەر بۆ زانین پێمان خۆشبوو ئەو (ئیجازە نامە) یە وەك خۆی بڵاوبکەینەوە :



((الحمد لله رب العالمين، والصلاة والسلام على رسوله سيدنا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين، أما بعد: فقد قرأ وتدرّس عندي أخي الصغير (عبد المجيد بن ميرزا) النورسي العلوم الآلية والعقلية وأكمل النسخ التي جرت عادة العلماء على إقرائها وقراءتها في مملكتنا، ولما نظرت إلى استعداده وذكائه، وفتشت عن معلوماته ومحفوظاته، وجربت اقتداره على التدريس والتعليم وتبين لي لياقته للوظيفية التدريسية، وكفاية معلوماته

---

(١) (چەند چەپکێ بیرەوەری سەبارەت بە سەعیدی نوورسی / (أسيد إحسان قاسم) چەپکی کردوون و لە تورکیەوە کردوونی بە کوردی ــ (حبيب محمد سعيد) یش لە عەرەبیەوە کردوونی بە کوردی / ساڵی چاپ (١٩٩٥ م) ، ل ٨٥) .

للإرشادات العلمية أجزته حسب ما جرت عليه العادة من إعطاء الأساتيذ "الإجازة" لمن استكمل النسخ من التلاميذ في تدريس وتعليم ما قرأ عندي من العلوم، إلى يوم الوقت المعلوم كما أجازني أستاذي المولى محمد الجلالي رحمة الله عليه، وهو قد أخذ الإجازة من مولاه ذي النفع العميم، والقلب السليم، السيد فهيم قدس سره، وهو قد أخذ الإجازة من أعلم علماء دهره، وأفضل فضلاء عصره، الشيخ عبيد الله الشمدناني قدس سره، وهو قد أجيز من أكابر العلماء، وأشهر الفضلاء، واحدا بعد واحد متسلسلا إلى الإمام محمد الغزالي قدس سره، وهو قد رخص وأذن له في إرشاد العباد ظاهرا وباطنا من قبل السادة العظام، والقادة الكرام، منتهيا إلى المعدود من الأئمة الاثني عشر- مولانا حضرة جعفر الصادق، رضي الله عنه، وهو قد أخذ الفيض معنى وباطنا من الإمام أمير المؤمنين علي بن أبي طالب رضي الله عنه. وكما أجازني علامة زمانه، ومصباح أوانه أستاذي فتح الله الإسعردي، وهو قد نال رتبة التدريس في العقليات والنقليات بالإجازة والرخصة، عن والده عمر، وهو عن جده الأكبر محمد خليل الإسعردي، وانتهى المجيزون له بالواسطة إلى العلامة الشهير سعد الدين التفتازاني، ومنه إلى الإمام فخر الدين الرازي)). [١]

### ٣) قۆناغەکانی خوێندن و پلەی زانستی و لێهاتوویی :

هەر لە تەمەنی حەوت (٧) ساڵییەوە مامۆستا نوورسی چۆتە حوجرەکان و، لای باوکی حوجرەی تەواو کرد، وە لە تەمەنی نۆ (٩) ساڵیدا لای مەلا (عبدالله) ی برا گەورەی زانستی (نحو) و (صرف) ی خوێندووە، وە دەگێڕنەوە کە زۆر زیرەك و بلیمەت بووە لە دەرخ کردنی وانەکان و موتالاکردنیان [٢] ، وە هەموو کتێبی (جمع الجوامع) کە سەر بە زانستی (أصول الفقه) ە لەبەر کردووە، وە هەروەها

---

(١) لە پێگەی (الأكاديمية للقراءات العشر والسنة النبوية) وەرگیراوە.

(٢) (حسن عبدالرحمن بكير- بديع الزمان سعيد النورسي وأثره في الفكر والدعوة/ ١٨٧٧- ١٩٦٠).

فەرهەنگی (محیط) ی فەیروزئابادی لە پیتی (س) ە وە لەبەرکردووە، لەبەر ئەوە بووە کە زانایانی ئەو سەردەمە ناویان ناوە سەعیدی مەشهوور (بدیع الزمان) [١] .

هەر بۆیە لە تەمەنی چوارده (١٤) ساڵیدا بڕوانامەی زانستی ئایینی (إجازة علمي) وەرگرتووە، وە لە ساڵی (١٨٩٣ م) لە شاری (وان) لە زانستەکانی وەکو : (بیرکاری و ، فیزیا و ، کیمیا و ، زەوی ناسی و ، فەلسەفە و ، مێژوو) ی خوێندووە [٢] و، لە هەندێکیشیاندا کتێبی داناوە.

مامۆستا نوورسی لە تەمەنی هەژده (١٨) ساڵیدا زانستە ئایینیەکانی وەرگرتووە لە زانستە ئەقڵییەکان، وە کاری وانەبێژی بووە بۆ ماوەی پانزە (١٥) ساڵ لە شاری (وان) [٣] .

بۆ مەبەستی موتاڵاکردن و خوێندنەوەی ئەو کتێبانەی پێویستی بوون سوودی لە کتێبخانە پڕ لە کتێبەکانی (عومەر پاشا) ی والی بەدلیس و (تایەر پاشا) ی والی (وان) وەرگرتووە کە ڕێزی زۆریان لێناوە و بایەخیان پێداوە [٤] .

**٤) قۆناغەکانی ژیانی سەعید نوورسی :**

**قۆناغی یەکەم:** کە لە ساڵی (١٨٧٣ م) بۆ ساڵی (١٩٠٧ م) دەست پێ دەکات کە بریتیە لە قۆناغی لەدایك بوون و منداڵی و فێربوونی زانست و بڵاوبوونەوەی ناوبانگیەتی لە نێوان خەڵکدا و لە نێوان لادێ و شارەکانی کوردستانی تورکیادا [٥] .

---

(١) (بديع الزمان سعيد النورسي ـ مختارات من المثنوي العربي النوري/ ص ٥) .

(٢) (بديع الزمان سعيد النورسي ـ حقيقة التوحيد والتوحيد الحقيقي ـ ترجمة : إحسان قاسم الصالحي / ص ٥) .

(٣) (الطرق الصوفية ظروف النشأة وطبيعة الدور ـ ممدوح الزوبي / ص ١٨٧) .

(٤) (پوختەی چەند لایەنێکی ژیانی زانای گەورەی کورد سەعیدی نوورسی ـ نووسینی: فاروق ڕەسوڵ یەحیا / ل ٧) .

(٥) (سعيد النورسي حركته ومشروعه الإصلاحي في تركيا ـ آزاد سعيد سمو / ص ٦٤ ـ ٦٥) .

**قۆناغی دووەم:** کە لە ساڵی (١٩٠٧ م) بۆ ساڵی (١٩٢٣ م) دەست پێ دەکات کە بریتیە لە قۆناغی گواستنەوە بۆ ئەستەنبول و مومارەسەی کاری سیاسی و بەشداری لە پێکهێنانی کۆمەڵەکان و ، کاری ڕۆژنامەگەری و سەفەرکردنی بۆ وڵاتانی (شام) و (بەیروت) ، وە بەشداری کردن لە جەنگی یەکەمی جیهانی [١] .

**قۆناغی سێیەم:** کە لە ساڵی (١٩٢٣ م) بۆ ساڵی (١٩٤٩ م) دەست پێ دەکات کە بریتیە لە قۆناغی ناڕەحەتی و ڕووبەڕوو بوونەوەی لەگەڵ دوژمنانی ئایین و دادگایی کردن و زیندانی کردن و لە کۆتایی دا دوورخستنەوەی و دانانی پەیامەکانی نوور [٢] .

**قۆناغی چوارەم:** کە لە ساڵی (١٩٤٩ م) بۆ ساڵی (١٩٦٠ م) دەست پێ دەکات کە بریتیە لە قۆناغی کۆتایی هاتن بە زیندانی بۆ ماوەی چارەکە سەدەیەك و جێگیربوون، واتە قۆناغی کۆتایی هاتنی دادگایەکانی بوو، وە چاپکردنی پەیامەکانی نوور بوو، وە نزیکبوونەوە لەکۆتایی هاتنی تەمەنی پڕخێری بوو [٣] .

## ٥) هاوسەرگرتنی سەعید نوورسی :

مامۆستا نوورسی لە ژیانیدا هاوسەری نەگرتووە.

## ٦) هەڵسوکەوتی مامۆستا نوورسی لەگەڵ کەسانی چواردەوریدا [٤] :

پێشەوا نوورسی لەناو قوتابیەکانیدا چ لە ڕووی بیرکردنەوە و چ لە ڕووی

---

(١) (هەمان سەرچاوەی پێشوو / ص ٩٤ ـ ٩٥) .

(٢) ( هەمان سەرچاوەی پێشوو / ص ٦٤ ـ ٦٥) .

(٣) ( هەمان سەرچاوەی پێشوو / ص ١٢٣) .

(٤) (چەند چەپکێ بیرەوەری سەبارەت بە سەعیدی نوورسی / (أسید إحسان قاسم) چەپکی کردوون و لە تورکیەوە کردوونی بە کوردی ـ (حبیب محمد سعید) یش لە عەرەبیەوە کردوونی بە کوردی / ساڵی چاپ (١٩٩٥ م) ، ل ٨ ـ ٩ ، ١٢ ـ ١٣ ، ١٩ ـ ٢٠ ، ٢٦ ـ ٢٧) .

ڕەفتارەوە پابەندبوو بە ئاکارە ئیسلامیەکانەوە و، هەمیشە ڕێنمایی کردوون بۆ بەندایەتی ڕاستەقینە و بەردەوام بوون لەسەر یەکخواپەرستی و پابەندبوون بە ڕەوشتی خواناسان و باوەڕدارانەوە.

• (مەلا حەمید) کە یەکێکە لە قوتابیە بە ئەمەك و دڵسۆزەکانی مامۆستا نوورسی و لە خزمەتی مامۆستادا لەکێوی (ئەرەك) و لە مزگەوتی گوندی (نوورشین) ی نزیك شاری (وان) ژیانی بردۆتە سەر، بۆمان دەگێڕێتەوە و دەڵێ : کە نوێژم لە دوای مامۆستاوە دەکرد زۆر دڵم دەکرایەوە، چونکە نوێژکردنی سام و خشوعی مرۆڤی زیاد دەکرد.

ڕێنماییشی دەکردین بۆ ئەوە کە زیکری دوای نوێژ وەك ناوك و تۆوی نوێژەکە وایە. ئەوە بوو بە دەنگێکی نەرمی غەمگینەوە تەسبیحات و زیکری خوای دەکرد... کاتێ کە دەیوت: (سبحان الله ... سبحان الله) بە شێوەیەك لەسەرخۆ و لە قوڵایی ناخی دڵیەوە دەردەهات و دەمان بیست.

من خۆم هەرچەند مامۆستا و زانای زۆرم دیون، تا ئێستا کەسێکم نەدیوە وەك مامۆستا بەم خشوع و غەمگینییەوە نوێژ بەجێ بێنێ و زیکر بکا.

کاتێکیش کە دەیوت: (لا إله إلا الله) و دەستی بە تەسبیحات دەکرد و لە سەری بەردەوام دەبوو، لە هێز و توندیی دا دەنگی وەك گرمەی تۆپی لێ دەهات، جا ئەگەر کەسێکی ئەهلی تەریقەتی صۆفی لە لایدا بوایە ئەوا حاڵی لێ دەهات.

• هەروەها بۆمان دەگێڕێتەوە و دەڵێ : مامۆستا هەموو شەوێ هەڵدەستا بۆ شەونوێژ... جار جارێ کە چاوم لێ بوو نوێژی دەکرد، خەوم لێ دەزڕا.. ئەویش کە دەیبینیم بەخەبەرم، پێمی دەوت: مادام بە خەبەری وەرە لە پاڕانەوەدا بەشداریم بکە. بەڵام من هیچ نزایەکم ڕەوان نەبوو، بۆیە پێی دەوتم: من دەپاڕێمەوە و تۆیش بە دواما ئامین بڵێ. من بە نزاکەی سەردارمان یونس پێغەمبەر (سەلامی خوای

لەسـەر بـێ) و، نزاکـەی ئووەیسـی قـەرەنی دەپاڕێمـەوە و بـە هـەردووکیان لـە دەرگانەی ڕەحمەتی خوا دەدەم.

لە کاتی پاڕانەوەکەدا جار بە جارێکیش وەنەوز دەیبردمەوە، ئـەویش سـەیری دەکردم و دەیوت: منیش وەك تۆ بووم، تۆیش ڕادێیت.

● (شوکت دمـبر آی) ، ئـەو سـەربازەی گواسـتنەوەی مامۆسـتا نوورسـی بـۆ (بارلا) خرایە ئەستۆی، بۆمان دەگێڕێتـەوە و دەڵـێ : لـە شـاری (ئەگریـدیر) بـووم، بەیانیـەکیان بـانگ کـرام بـۆ بنکـەی شـارەوانی، چـووم دەبیـنم وا فەرمانـدار و فەرماندەی ژاندرمـە (دەرەك) و ئەنـدامانی دەسـتەی شـارەوانی و پیـاوێکی مێـزەر بەسەر، کە جبەیەکی لەبەردایە و خاوەنی هەیئەت و ویقارێکە، لەوێن.

فەرمانـدەی ژاندرمـە ڕووی تـێ کـردم: کـوڕم گـوێ بگـرە، پێویسـتە ئـەم مامۆستایەمان کە بە (بـدیع الزمـان) ناسـراوە ببـەیت بـۆ (بـارلا) . ئـەم کـارەت زۆر گرنگە، کاتێ لەوێش بە پۆلیسخانەی دەسپێری با لـە سـەر نووسـراوە ڕەسمیـەکان ئیمزای بکەن و دوای ئەوە ئێمەشی لێ ئاگادار بکە. وتم: زۆر چاکە گەورەم..

لەگەڵ مامۆستا کەوتینە ڕێ .. لە ڕێ دا پێم وت: مامۆستا گیـان، جـەنابت لـە جێی باوکمی ئەمەش کارە و خراوەتە ئەستۆم. هیوادارم لێم نەڕەنجێی.

دوای ئەوە باسی گەشتەکەیان بە بەلەمی چارۆکەدار دەکا و دەڵـێ : زۆر سـارد بوو.. وەرزی زستان بوو.. ئاوی دەریاچەکەش بەینا و بـەین بەسـتبووی، یـەکێ لـە سەوڵ لێدەرانی بەلەمەکە لە پێشەوە بە داردەستێکی گەورە سەهۆڵەکەی دەشکاند و ڕێی بۆ بەلەمەکە دەکردەوە.

مامۆستا (بدیع الزمان) هەندێ مێوژ و شیرینی بەسەرماندا دابـەش کـرد.. مـن بـە وردیـی سـەرنجم دەدا، دەبیـنم تـەواو هـێمن و دامـەزراوە.. لـە دەریاچـەکە و چیاکانی دەورو بەرمان ورد دەبۆوە.. جا چـونکە ڕۆژگـار کـورت بـوو، خێـرا نوێـژی

عەصر هاتە کایەوە و ویستی بە پێوە نوێژەکەی بەجێ بێنێ، بەلەمەکەمان ڕوو بە قیبلە وەستاند و دەنگێکم بیست: (الله أکبر!) لە هەموو ژیانمدا (الله أکبر) ی وا پڕ لە سام و هەیبەت و خشوعم نەبیستبوو.. هەستم بە کرژبوونی مووی لەشمان دەکرد، هەڵسوکەوت و ڕەفتارەکانی لە ڕەفتاری مامۆستایانی تر نەدەچوو.

ئەوپەڕی هەوڵمان دەدا بەلەمەکە ڕوو لە قیبلە بوەستێنین. کاتێ مامۆستا لە نوێژەکەی بۆوە، ئاوڕی بۆ لامان دایەوە و وتی: سوپاستان دەکەم، براکانم! ماندووم کردن!

بەڕاستی پیاوێکی نەرم و نیان و ڕەوشت جوان بوو. دوای گەشتێکی دوو سەعاتی بە بەلەم گەیشتینە (بارلا) ، کاتێ مامۆستا خاوەنی بەلەمەکەی بینی وا هەوڵی ڕاوی کەو دەدا، کە لەو ناوچانەدا زۆرن، ئاگاداری کرد و پێی وت: وا بەرەو بەهار دەڕۆین و ئەم گیاندارانەش کاتی هێلکە و بێچووەکردنیانە. خۆزگە وازت لەم کارە بهێنایە. بەم وتە نەرمە لە ڕاوەکەی وازی پێ هێنا.

- (خلوصی یحیی گیل)[1] دەڵێ : لە یەکەم سەردانمدا بۆلای مامۆستا نوورسی، وام دەزانی شێخێکە لە شێخەکانی تەصەووف، کەچی بەر لەوەی من هیچ بڵێم، پێی وتم: براکەم! من شێخ نیم، من وەك (غەزالی) و ئیمامی (ڕەببانی) ئیمامم، چونکە چەرخەکەمان چەرخی پارێزگاریی ئیمانە نەك پارێزگاریی تەریقەت..

---

(١) (خەلوصی) یەکێکە لە قوتابیانی دێرینی مامۆستا نوورسی لە (بارلا) کە ئەو دەمە ئەفسەر بووە لە پلەی (نەقیب) دا.هەر پرسیارێکی ببوایە سەبارەت بابەتە ئیمانییەکان دەینـاردن بۆ مامۆستا نوورسی، ئەویش وەڵامی بۆ دەنووسیەوە. پاشان بەڕێنمایی خۆی ئەم وەڵامانە کۆکرانەوە و ناونران : (مەکتووبات) . ناوبراو لە ساڵی (١٩٨٦ م) و لە تەمەنی (٩١) ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە (پاشبەندەکان / بەرگی ٥ ، لاپەڕە ١٧) .

لە یەکێ لە سەردانەکانمدا بۆلای مامۆستا چامان لەلای خواردەوە، بەڵام من چای ناو پیاڵەکەم تەواو نەکرد و کەمێکی تێدا مایەوە، مامۆستا پێی وتم: براکەم! تۆ لە سوننەت ئاگادار نیت.

مەبەستی ئەوەبوو ڕێنموویيمان بکا بۆ ئەوەی کە تەواوکردنی ئەوەی وا لە ناو پیاڵەکەدا سوننەتێکە لە سوننەتەکانی پێغەمبەر و مانەوەی فەزڵە تیایدا ئیسرافە و ئیسرافیش پێچەوانەی سوننەتە.

**لە بارەی دلۆڤانی و بەزەیی مامۆستاوە بەرامبەر بە گیانداران و زیندەوەران چیرۆك و ڕووداوی زۆر هەن، بەڵام تەنها ئاماژە بە یەك دوانێکیان دەکەین:**

- (مەلا حەمید) بۆمان دەگێڕێتەوە و دەڵێ: لە ڕۆژێکی خەملاودا لەسەر کێوی (ئەرەك) مامۆستا پێی وتین: من دەستم بە زیکر و تەسبیحاتەکەمەوە گیراوە، ئێوە برۆن بۆ سەیران و پیاسەی ئەم دەشت و دەرە سەوزە.

کاتێ بەڕێوە چووین، قوم قومەیەکم بەسەر بەردێکەوە بەدی کرد و کوشتم.. کە گەڕاینەوە مامۆستا لە بارەی ئەو شوێنانەی کە ڕۆیشتین و ئەو کارانەی کردمان پرسیاری لێ کردین. منیش باسی سەیرانەکەمانم بۆ کرد، کە گەیشتمە باسی قوم قومەکە تووڕە بوو و بەلایەوە زۆر گران بوو و پێمی وت: ئەو بەستەزمانەت کوشت؟ پێم وت: وتەیەکی بەناوبانگمان هەیە ئەڵێ: هەرکەس حەوت قوم قومە بکوژێت پاداشتی حەجێکی دەست دەکەوێت! (مامۆستا) فەرمووی باشە دانیشە، با موناقەشە بکەین و بزانین کامیان ڕاستە؟

دوای ئەوە وتی: ئایا ئەو گیاندارە ڕێی لێ گرتوویت؟ وتم: نەخێر. وتی: ئایا هیچی لێ داگیر کردوویت؟ وتم: نەخێر. وتی: ئایا تۆ ڕۆزی دەدەیت؟ وتم: نەخێر. وتی: ئایا لە زەوی و زارتا سووڕایەوە؟ وتم: نەخێر. وتی: ئایا تۆ بەدیت هێناوە؟ وتم: نەخێر. وتی: ئایا دەزانی ئەم گیاندارانە بۆچی بەدیهێنراون و کاری سەرشانیان چی یە؟ وتم: نەخێر. وتی: ئایا بەدیهێنەر ئەم گیاندارانەی بۆ ئەوە بەدی هێناوە تۆ

بیان کوژیت؟ کێ پێی وتی بیکوژە؟ لە بەدیهێنانی ئەم گیاندارانەدا هەزار دانایی خوایی هەیە. جا براکەم بە کوشتنی ئەم گیاندارە تۆ هەڵەت کردووە.

- هەروەها بۆمان دەگێڕێتەوە و دەڵێ: بەرە بەرە دنیا ساردی دەکرد و زستانیش نزیك دەبۆوە.. ئێمەش هێشتا لەسەر کێوی ئەرەك بووین و، بە تەمای بارینی بەفر و بارانێکی زۆر بووین.. ئەو شوێنەش کە تیایدا دەژیاین لە شێوەی گردۆڵەیەکدا بوو.. مامۆستا ویستی لەسەر ئەو بەرزاییە ژوورێك دروست بکەین. کاتێ بناغەمان لێ دا شارە مێروولەیەك دەرکەوت، کە مامۆستا مێروولەکانی بینی نەیهێشت لەو شوێنەدا چاڵ هەڵکەنین، کە پرسیارمان لێ کرد، وتی: ئایا دروستە خانوویەك بە ڕووخاندنی خانوویەکی تر دروست بکەین؟ ماڵی ئەم گیاندارانە وێران مەکەن. لە شوێنێکی تردا چاڵ هەڵکەنن.

کە لە شوێنێکی تردا دەستمان بە هەڵکەندن کردەوە دیسان شارە مێروولەیەکی ترمان هاتەوە بەردەم، بۆ سێهەم جار قوتابییەك کە یارمەتی دەدام لێی پرسیم: ئایا ئەمە هەر وا بەردەوام بێت؟ با لە شوێنێکدا چاڵ هەڵکەنین، جا ئەگەر مێروولە دەرکەوتن بە خۆڵ دایان دەپۆشین تا مامۆستا نەیان بینێ، ئەگینا هەتا عیشا هەروا دەمێنینەوە و هیچمان نەکردووە، خۆ لەم شوێنەشدا بستێك نیە شارە مێروولەی تێدا نەبێ.

بە هەر حاڵ ژوورێکی بچووکمان بۆ مامۆستا دروست کرد، ئیتر مامۆستا هەرچی مێروولە و شارەکانی بدیایە ساوەر و شەکر و پارچە نانی پێشکەش دەکردن.

لە هۆی شەکر پێدانیان پرسیارمان لێ کرد، بە پێ کەنینەوە وتی: تا ئەو شەکرە چایی بێ بۆیان (مەبەستی ئەوەیە: ببێتە خواردنێکی سەرەکی بۆیان) .

### ٧) چاکسازییەکانی مامۆستا نوورسی:

**یەکەم : چاکسازی لە بواری پەروەردەیی دا :**

شێوازی چاکسازییەکانی نەرم و نیان و دانایی مەرجی سەرەکییە بۆ چاکسازی، بە بڕوای سەعیدی نوورسی مرۆڤ بە سروشتی خۆی ئارەزووی لەوەرگرتنی شتی باشە و کاتێك وشەی زبرو ڕەق دەبیستێت لێی ڕادەکات، وە مرۆڤی سەرپێچیکار کاتێك وتاری بۆ دەدرێت بە شێوازێکی نەرمونیان و داناییانە و ئامۆژگاری باش کاری لێ دەکات ، بەڵام ئەگەر لەگەڵیدا شێوازێکی تیژو تاوانبارانەی لەگەڵ بکاربهێنیت بە دوور نازانرێت لەسەر ئەو سەرپێچیەی بەردەوام بێت و تاوان ئەنجام بدات [1] .

**لەو ئامرازانەش کە مامۆستا نوورسی بەکاری دەهێنا بۆ چاکسازیی بریتی بوون لە [2] :**

١- دڵنیایی لەسەر دڵسۆزی و پەیوەندی بەخواوە.

٢- پشتیوانی پابەندبوون بە ئایینی پیرۆزی ئیسلام.

٣- دوورکەوتنەوە لە ڕەخنە و موناقەشەی زۆر.

٤- شێوازی دەستنیشان کردن.

بێگومان باشترین ئامراز بۆ جێ بەجێ کردنی چاکسازیی لە هەموو کۆمەڵگایەك بە چاکسازی تاك و پەروەردەکردن دەست پێ دەکات.

یەکێك لە ڕێگاکانی مامۆستا نوورسی بۆ تاکەکانی کۆمەڵگا ئەوەیە کە دەڵێ : خۆت بە گەورە نیشان مەدە، با بچووك نەبیتەوە، ئەیٚ ئەوکەسەی (ئەنا) یەکی دوو چەندانەی تێدایە و گرفتاری خۆ بە گەورە زانین و لە خۆبایی بوون بووە! پێویستە

---

(١) ( هەمان سەرچاوەی پێشوو / ص ٢٢٦) .

(٢) ( هەمان سەرچاوەی پێشوو / ص ٢٤٩) .

شارەزای ئەم پێوەرە بیت : هەموو کەسێك پەنجەرەیەکی هەیە، چ بۆ سەیرکردن و چ بۆ خۆپیشاندان، لێیەوە دەڕوانێتە کۆمەڵ، ئەو پەنجەرەیەش پێی دەوترێت (پلە و پایە) جا ئەگەر ئەو پەنجەرەیە لە باڵای نرخ و بەهای خۆی بەرزتر بوو ئەوا بە (تکبر) باڵای نرخ و بەهای خۆی درێژ دەکات تاکو لەم پەنجەرەیەوە دەربکەوێت، بەڵام گەر پەنجەرەکەی لە باڵای هیممەتی ئەو نزمتر بوو ئەوا بە (تواضـع) ە وە خۆی بچووك دەکاتەوە و دادەنەوێت تا لەو ئاستەدا دەبینێت و دەشبینرێت، پێوەری مەزنایەتی لە مرۆڤانی کامڵدا (تواضع) ە، بەڵام کەسانی بوودەڵە و ناتەواو پێوەری بچووکیان (تکبر) ە [١] .

**دووەم : چاکسازی لە بواری زانستی دا :**

کاتێ مامۆستا نوورسی سەردانی (ئەستەمبول) ی کرد لە ساڵی (١٨٩٦ م) پرۆژەیەکی پێشکەش کرد بۆ دانانی زانکۆیەکی ئیسلامی لە ڕۆژهەڵاتی (ئەنادۆڵ) بەناوی (زانکۆی زەهرا) لەسەر شێوازی (زانکۆی ئەزهەر) ی میصر، سوڵتان (عبدالحمید) ئەم پرۆژەیەی پەسەند کرد، بەڵام بەهۆی سەرهەڵدانی جەنگی یەکەمی جیهانی ئەم پرۆژە شکستی هێنا [٢] .

---

(١) (بریسکەکان ـ نووسینی: سەعیدی نوورسی ، وەرگێڕانی بۆ زمانی کوردی: فاروق ڕەسوڵ یەحیا / بەرگی ٣ ، ل ٨٠٢) .

(٢) (بديع الزمان سعيد النورسي– حقيقة التوحيد– د. محمد سعيد رمضان بۆتانی/ ص٥– ٦) .




**سوڵتان عبدالحمیدی دووەم**

مامۆستا نوورسی دەربارەی گرنگی زانست دەڵێت : بە زانست و ژیری، بەڵکو بە بینین چەسپاوە کە: پەیوەندی یاساکانی لەمەڕ تەن و قەبارە بەرزەکان وەك : (کێشکەر و پاڵنەر) ، هەروەها گوێزەرەوە و بڵاوکەرەوەی ئەو هێزانەی کە لە ماددەدا هەن وەکو (ڕووناکی و، گەرمی و، کارەبا) ئەو شتەی کە هەریەك لەو کارانە ڕادەپەڕێنێت لە ڕاستیدا ماددەیە کە لە فەزادا هەیە و، ماددەی هەڵم لەگەڵ ئەوەشدا هەر بە ماددەی هەڵم دەمێنێتەوە، کەچی وەکو ماددەکانی تر چەند جۆرو شێوەیەکی جیا جیا لەخۆ دەگرێت، چونکە هەرسێ شێوەی گازی و شلەمەنی و ڕەقی، کە تەنها یەك ماددە دروست دەبێت، وەك : هەڵم و سەهۆڵ و ئاو، بەهەمان جۆر ژیری هیچ ڕێگرمان نابێت و ناڕازیشی لەوەنیە کە ماددەیەکی هەڵم حەوت جۆر چین هەبێت ، گەر بە وردی سەیری تەن و قەبارە بەرزەکان بکرێت، جیاوازی لە نێوان چینەکانی دا دەبینرێت، چونکە هەروەك ئەو چینەی ڕێی کاکێشانی تێدایە و وە کۆمەڵەی هەور دیارە، هەرگیز لە چینی ئەستێرە چەسپیوەکان ناچێت، تەنانەت ئەستێرەکانی چینە نەچەسپیوەکان بە وێنەی میوەی هاوین کامڵ و پێگەیشتوو دەردەکەون، کەچی گەلێ ئەستێرەی بێ سنووری ڕێگای کاکێشان کە وەك هەور دەبینرێن تازەکی پێکدێنن و بەرەو پێگەیشتن و کامڵبوون دەڕۆن، هەروەك بە ڕووداوێکی ڕاست دەزانرێت کە چینی ئەستێرە نەجووڵەکان لە کۆمەڵەی خۆر ناچێت بەمجۆرە، لە ڕێی ڕووداو و هەستەوە،

واتا خێرایی زەینی مرۆڤ لە تێگەیشتندا جیاوازی نێوان حەوت کۆمەڵەکە و حەوت چینەکان هەست پێدەکرێت [١] .

**سێیەم : چاکسازی لە بواری کۆمەڵایەتی دا :**

مامۆستا نوورسی چاکسازی کۆمەڵایەتی لە کۆمەڵگادا لە خێزانەوە دەست پێ دەکات و دەڵێت : خێزان ماڵێکی بچووکە بۆ مرۆڤ ، کۆمەڵگاش لەو پێکهاتووە و ژیانی مرۆڤ ماڵێکی بچووکە سەرەڕای ئەوەی کە ئارام و سەربەخۆو دروستکراو بێت، لەسەر بنچینەی چاك، مرۆڤ کوڕی ژینگەکەیەتی کە کاری تێدەکات، وا دەڕواننە ئەو ژینگەیە چاك بێت یان خراپ بێت لەبەر ئەوە پێویست بوو لەسەر بانگەوازکاران کە هەوڵ و تێکۆشانی گەورە بخەنە گەڕ بۆ چاکسازی کۆمەڵگا بۆ گونجاندن لە نێوان تاکەکانی پاراستنیان لە پەرش و بڵاوی و دووبەرەکی و دوور لە غەش و هەموو نەخۆشییە کۆمەڵایەتییەکانی تر، مامۆستا نوورسی لە چاکسازی دا ڕێگای دکتۆرەکانی گرتبووە بەر بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشییەکان، هەروەك چۆن دکتۆر هەڵدەستێت بە دیاری کردنی نەخۆشییەکان و دانانی چارەسەر بە شێوازێکی سووك و ئاسان، بەم شێوەیە مامۆستا نوورسی لە سەرەتای کارەکەی دا هەڵدەستا بە دیاری کردنی نەخۆشی کۆمەڵگا و دانانی چارەسەر بۆی [٢] .

**چوارەم : چاکسازی لە بواری ئابووری دا :**

مامۆستا نوورسی لە چاکسازی ئابووریدا کۆمەڵێك ڕێنمایی گرتەبەر وەکو :

١– هاندان لەسەر زەکاتدان بەوەی کە زەکات گرنگییەکی گەورەی هەیە و بەشداری ڕاستەوخۆی هەیە لەسەر چارەسەر کردنی کێشە ئابووریەکاندا.

---

(١) (بریسکەکان ــ نووسینی: سەعیدی نوورسی ، وەرگێڕانی بۆ زمانی کوردی: فاروق ڕەسوڵ یەحیا / بەرگی ٣ ، ل ١٣٢ ــ ١٣٣) .

(٢) (سعيد النورسي حركته ومشروعه الإصلاحي في تركيا ــ د. آزاد سعيد سمو / ص ٢٧٠) .

٢- هاندان لەسەر کاسبی و کارکردن و پەیداکردنی ڕۆزی، ئیسلام زۆر هانمان دەدات لەسەر کاکردن و پەیداکردنی ڕۆزی، هەروەها ئیسلام موسوڵمان هان دەدات کە ببێتە ڕەگەزێکی بەسوود و بەرهەمهێن لە کۆمەڵگاکەیدا و نەبێتە کەسێکی بار بەسەریانەوە و پشت ببەستێ بە کەسانی تر لە پەیداکردنی بژێوی ژیان و هەموو پێداویستیەکانی تری..

٣- ڕێنمایی بەکاربەر و هەوڵدان بۆ بەرهەمهێنانی سەرچاوەی وزەو پێویستی..

بەڕای مامۆستا نوورسی ڕێنمایی لە بەکاربردن سوودی زۆری هەیە بۆ تاك و کۆمەڵگا لەسەر شێوازێکی یەکسان، لەم سوودانەش :

أ- هاتنە خوارەوەی خێرو بەرەکەت و پارێزگاری لەسەر ڕێزی مرۆڤ ، پێویستە لەسەر بەکاربەر کە تاك بێت یان دەوڵەت بێت هاوسەنگی بکات لە نێوان ئەوکەسانەی دەچنە ناوی، چونکە ئەوە نەکات تووشی گیروگرفت دەبێت لە بودجەکەیدا..

ب- سوپاس کردنی خوا لەسەر نیعمەتەکانی، ئەو مرۆڤەی پابەندە لە ڕێنوێنی لە بەکاربردندا، ئەوکەسەیە سوپاسی خوای گەورە دەکات لە نازو نیعمەتەکانی کە بەسەریدا ڕژاوە، نیعمەت ئەو شتەیە کە خوای گەورە دەیدات بە بەندەکانی، وە پێویستە لەسەر مرۆڤ بەفیڕۆی نەدا.

ج- بێگومان هەموو تاکەکانی کۆمەڵگا لەسەر یەك پلە نین لە ڕووی ئابوورییەوە، لەبەر ئەوە چینی هەژار بە بەردەوامی چاویان لە دەوڵەمەندە بەوەی دەوڵەمەند دەیبەخشێت یان بە فیڕۆی دەدات بە ئاسانی [1] ..

---

(١) (سعيد النورسي حركته ومشروعه الإصلاحي في تركيا ـ د. آزاد سعيد سمو / ص ٣١٥ ـ ٣١٧) .

**پێنجەم : چاكسازی لە بواری سیاسی دا :**

مامۆستا نوورسی كاتێك باس لە سەركردەكان دەكات، دەڵێت : تەنها یەك ڕەوشت لەسەر یەك شێوە لە چەند جێیەكی جیاجیادا جۆراو جۆر دەردەكەوێ ، تاوێك ناشیرین و تاوێكی تریش بە مەلائیكەتێكی ڕۆح سووك دەردەكەوێت، جارێك باش و جارێك خراپ دەبینرێت، ئەمانەی خوارەوە نموونەی ڕوونكردنەوەن، ئەو دەروون بەرزیەی كە لاوازە بەرامبەر بەهێزان هەستی پێ دەكەن گەر لە مرۆڤی بەهێزدا بێت بە (تكبر) و لە خۆبایی بوون دادەنرێت، هەروەها ئەو (تواضع) ەش كە مرۆڤی بەهێز بەرامبەر لاواز هەستی پێ دەكات گەر لە بابای لاوازدا بێت بە زەلیلی دادەنرێت [1] .

جددیەت و لێبڕانی كاربەدەستان و حوكمڕانان لە ڕێ و شوێنی كارەكانیاندا (ویقار) و نەرم و نیانی لەوێدایە بە (زەلیلی) لە قەڵەم دەدرێت، بەڵام ئەگەر ئەو جددیەتە لە ماڵەوەدا دەربڕێت ئەوا دەبێتە بەڵگەی (تكبر) و گەر نەرم و نیانیش بێت ئەوا بەڵگەی (تواضع) [2] .

**٨) ئەو هەواڵەی كە سەرلەبەری مامۆستا نوورسی گۆڕی و پاشان كەوتە هەوڵ و تێكۆشان بۆ بڵاوكردنەوەی پەیامی ئیسلام كە دواتر ناوی دەركرد بە (كۆمەڵی نوور) :**

لە ساڵی (١٨٩٧ م) دا مامۆستا سەعیدی نوورسی ئەو هەواڵەی لە ڕۆژنامە ناوخۆییەكاندا خوێندەوە كە : (گلادستۆن) ی وەزیری موستەعمەراتی بەریتانیا لە

---

(١) (بریسكەكان ـ نووسینی: سەعیدی نوورسی ، وەرگێڕانی بۆ زمانی كوردی: فاروق ڕەسوڵ یەحیا / بەرگی ٣ ، ل ٨٠٣) .

(٢) (هەمان سەرچاوەی پێشوو / بەرگی ٣ ، ل ٨٠٤) .

پەرلەمانی وڵاتەکەیدا نوسخەیەکی (قورئانی پیرۆز) ی بە دەستەوە گرتووە و بە ئەندامانی پەرلەمانی وتووە : (هەتا ئەم قورئانە لەناو موسوڵماناندا بمێنێت ئێمە ناتوانین حوکمڕانیان بکەین، کەواتە چار تەنها ئەوەیە کە قورئان لەسەر زەویدا نەهێڵین، یاخود پەیوەندیی موسوڵمانەکانی پێوە بپچڕین) !



وێنەی گلادستون و السیر أنتونی

ئەم هەواڵە تەزووی بە جەستەی (سەعیدی نوورسی) دا هێناو حەوانەوە و سرەوتی لێ بڕی و، بۆ هەموو کەسانی دەوروبەری خۆی بە ئاشکرا ڕاگەیاند کە : (دەبێ بە بەڵگە بۆ هەموو جیهانی بچەسپێنم و پێیان بسەلمێنم کە "قورئانی پیرۆز" خۆرێکی مەعنەوی یە، تیشکی ئەو خۆرە هەرگیز کز نابێت و ڕووناکیەکەشی بە هیچ کەسێك ناکوژێتەوە) [1] .



---

(١) (پوختەی چەند لایەنێکی ژیانی زانای گەورەی کورد سەعیدی نوورسی ـ نووسینی: فاروق ڕەسوڵ یەحیا / ل ٨) .

### ٩) دانراوو نووسینەکانی مامۆستا نوورسی :

شایانی باسە مامۆستا سەعیدی نوورسی بە چەند زمانێ پەیامەکانی نووسیوە لەوانە (تورکی ، عەرەبی ، کوردی ) ، لە سەرەتادا ئەم پەیامانە دەستنووس بووە و بە شێوەی نامیلکە بڵاوی کردوونەتەوە، ئەمەش لە سالآنی (١٩٢٧ – ١٩٥٠) ی میلادیدا بووە، بەڵام دوای ئەوەی حکومەت دوو لیژنە لە پیاوانی خۆی و مامۆستایانی ئاینی دادەنێ بۆ پێداچوونەوە و چاوخشاندن بە بابەت و باسەکانی ناو ئەم پەیامانەدا ئەویش بۆ دوو مەبەست :

یەکەم : بزانن ئایا ئەم پەیامانە دژ بە بنەما ئاینیەکانی ئیسلام نەنووسراون و پێچەوانەی دەقە قورئانییەکان نین.؟

دووەم : بزانن لە ڕووی فیکری و ئایدۆلۆژیاوە هیچ زیانێکی بۆ دارو دەستەکەی حکومەت تێدا نیە. ! ؟

دوای ئەوەی هەردوو لیژنەکە گەیشتنە ئەو قەناعەتەی کە ئەم پەیامانە بێ خەوش و سەرچاوەی لە قورئانەوە گرتووە و دوورن لە سیاسەت و تەداخولاتی حیزبی، بڕیاریاندا کە مافی چاپ کردن بدرێ بەم پەیامانە و بە شێوەیەکی ڕەسمی بڵاوبکرێنەوە.

لە پاش ئەو بڕیارە ئیتر مامۆستا لە سالآنی (١٩٥٦ – ١٩٥٩) میلادی هەستا بە کۆکردنەوەی سەرجەم (پەیامەکانی نوور) لە دوو توێی چەند بەرگێکدا کە ئەویش بریتین لەمانە:

**ئەو کتێبانەی کە تەنها بە زمانی (تورکی) نووسیونی بریتین لە :**

١. **سۆزلەر (واتە: وتەکان)** : کە پێکدێت لە (٣٣) نامە ، لەلایەن مامۆستا (إحسان قاسم صالح) ەوە وەرگێردراوەتە سەر زمانی (عەرەبی) و، دواتریش لەلایەن مامۆستا (فاروق ڕەسوڵ یەحیا) وە وەرگێڕدراوە بۆ زمانی (کوردی) .

٢. **مەكتووبات (واتە: نامەكان)** : كە پێكدێت لە (٣٣) نامە ، لەلایەن مامۆستا (إحسان قاسم صالح) ەوە وەرگێردراوەتە سەر زمانی (عەرەبی) و، دواتریش لەلایەن مامۆستا (فاروق ڕەسوڵ یەحیا) وە وەرگێڕدراوە بۆ زمانی (كوردی) .

٣. **لمعەلەر (واتە: بریسكەكان)** : كە پێكدێت لە (٣٣) نامە ، لەلایەن مامۆستا (إحسان قاسم صالح) ەوە وەرگێردراوەتە سەر زمانی (عەرەبی) و، دواتریش لەلایەن مامۆستا (فاروق ڕەسوڵ یەحیا) وە وەرگێڕدراوە بۆ زمانی (كوردی) .

٤. **شعاعلەر (واتە: تیشكەكان)** : كە پێكدێت لە (١٥) نامە ، لەلایەن مامۆستا (إحسان قاسم صالح) ەوە وەرگێردراوەتە سەر زمانی (عەرەبی) و ، دواتریش لەلایەن مامۆستا (فاروق ڕەسوڵ یەحیا) وە وەرگێڕدراوە بۆ زمانی (كوردی) .

٥. **لاحقەلەر (واتە: پاشبەندەكان)** : لەلایەن مامۆستا (إحسان قاسم صالح) ە وە وەرگێردراوەتە سەر زمانی (عەرەبی) و، دواتریش لەلایەن مامۆستا (فاروق ڕەسوڵ یەحیا) وە وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی (كوردی) . (پاشبەندەكان) كە سێ كتێبی جیا جیا و سەربەخۆن، كە بریتین لە: یەكەم: (**پاشبەندی بارلا**) : ئەو نامانەی لەخۆ گرتووە كە لە سەرەتای ڕەهەندە بوونی مامۆستا نوورسی بۆ (بارلا) لە ساڵی (١٩٢٧ م) و نیشتەجێ كردنی زۆرەملێی لەوێ، نووسران.. تا ئەو دەمەی كە ساڵی (١٩٣٥ م) لەگەڵ قوتابیانیدا بران بۆ دادگای گەورەی جەزا لە شاری (ئەسكی شەهر) و بە بەندیخانەی ئەوێ سپێرران. دووەم: (**پاشبەندی قەستەمۆنی**) ئەو نامانەی نێوان مامۆستا نوورسی و قوتابیانی ئەوی لەخۆ گرتووە كە دوای بەسەر بردنی ماوەی حوكمەكەی لە بەندیخانەی (ئەسكی شەهر) و نەفی كردنی بۆ (قەستەمۆنی) لە ساڵی (١٩٣٦ م) و نیشتەجێ كردنی زۆرەملێی لەوێ، دەگرێتەوە.. هەتا بردنی خۆی و قوتابیانی نوور بۆ دادگای (دەنیزلی) لە ساڵی (١٩٤٤ م) دا. سێیەم: (**پاشبەندی ئەمیرداغ**) ئەمیش دوو بەشە: بەشی یەكەمیان :

ئەو نامانەی مامۆستا نوورسین کە دوای دەرچوونی بڕیاری بێ تاوانی لە دادگای (دەنیزلی) ساڵی (١٩٤٤ م) و نیشتەجێ کردنی زۆرەملێی لە شاری (ئەمیرداغ) نووسیویەتی. ئەم بەشە بە تەواوبوونی ساڵی (١٩٤٧ م) کۆتایی پێ دێت، کە لەوبەروارەدا بردران بۆبەندیخانە ترسناکەکەی (ئافیوون) . بەشی دووەمیشی : لە ساڵی (١٩٤٨ م) یەوە دەست پێ دەکات، واتە دوای ئازادبوونی مامۆستا نوورسی و قوتابیانی لە بەندیخانەی (ئافیوون) و گەڕانەوەی بۆ (ئەمیرداغ) و نیشتەجێ کردنی زۆرەملێی لەوێ هەتا کۆچی دوایی [1] .

٦. **تاریخجة حیاة** : (واتە: مێژووی ژیان) سیرەی زاتی مامۆستا خۆیەتی [2].

٧. **سنوحات** : (ئەم کتێبە لەلایەن مامۆستا (إحسان قاسم صالح) ەوە وەرگێردراوەتە سەر زمانی عەرەبی بە ناوی "سانحات " ) .

٨. **طلوعات.**

٩. **إشارات.**

١٠. **رموز.**

---

(١) ( هەمان سەرچاوەی پێشوو بەڵام / ص ١٢٣) .

(٢) (پاشبەندەکان / نووسینی : مامۆستا سەعیدی نوورسی ــ وەرگێڕانی لە عەرەبیەوە بۆ کوردی: فاروق ڕەسوڵ یەحیا / بەرگی ٥ ، ل ٦ ــ ٧) .

**ئەو كتێبانەی كە بە زمانی (توركی و عەرەبی) ش نووسیونی و لە ژێرناونیشانی (آثار بديعية)** [1] **لە بەرگی (صيقل الإسلامي) دا كۆی كردوونەتەوە بریتین لە :**

١. **المحاكمات عقلية.**

٢. **المناظرات.**

٣. **الخطبة الشامية:** بریتیە لەو وتارەی كە لە ساڵی (١٩١١ م) دا لە سەردانی بۆ وڵاتی (شام) ، لەسەر مینبەری مزگەوتی (ئەمەوی) لە دیمەشق بە زمانی عەرەبی دای و ئاڕاستەی زانایانی ئەو وڵاتەی كردبوو، كە دواتر بەناونیشانی (الخطبة الشامية) ناوبانگی دەركرد و چەند جارێك چاپ كراو، پاشان هەر خۆی بە درێژەپێدانەوە وەرێگێڕا بۆ زمانی (توركی) [2] .

٤. **الخطوات الست:** ئەو نامیلكەیە بوو كاتێك ئینگلیزەكان ئەستەمبوڵیان داگیركرد لە ئازاری (١٩٢٠ م) سەعیدی نوورسی ئەو نامیلكەیەی دانا، كە تیایدا زۆر بە توندی هێرشی كردە سەر ئینگلیزەكان و، هۆكارەكانی نائومێدی تێدا پووچەڵ كردبووەوە و هانی خەڵكیدا كە نا ئومێد نەبن [3] .

**ئەو كتێبانەی كە تەنها بە زمانی (عەرەبی) نووسیونی بریتین لە :**

١. **قزل إيجاز على سلم المنطق.**

٢. **تعليقات في المنطق.**

---

(١) (واتە: ئەسەرەكانی پێشین) .

(٢) (وتەكان / نووسینی : مامۆستا سەعیدی نوورسی ــ وەرگێڕانی : فاروق ڕەسوڵ یەحیا / بەرگی ١ ، ل ٩٨٠) .

(٣) (سەرچاوەی پێشوو / بەرگی ١ ، ل ٩٨١) .

٣. **إشارات الإعجاز في مظان الإيجاز**: ئەم کتێبە لە گەرمەی جەنگدا دایناوە (کە ئێستا لە بەشی خوێندنی دوکتۆرای وانەی " تەفسیر" لە زانکۆی ئەزهەر بە دەرس دەخوێنرێت) [١].

٤. **المثنوي العربي النوري**.

ئەوەش کە بە زمانی (کوردی) ش نووسیویەتی تەنها بریتییە لەم بابەتە کە بەناوی: (ئەی گەلی کوردان) لە ژمارە یەکی گۆڤاری (تعاون ترقی کورد) ساڵی (١٩٠٨) لە ئەستەنبوڵ بڵاوی کردۆتەوە [٢].



إحسان قاسم الصالحي



فاروق رسول یەحیا

## ١٠) مێژووی کۆچی دوایی [٣]:

لە سەعات سێ و نیوی (شەوی قەدر) ی مانگی ڕەمەزانی ساڵ (١٣٧٩) ی کۆچی بەرامبەر (٢٣ / ٣ / ١٩٦٠) زایینی بە دەم بانگی پەروەردگاریەوە ڕۆیشت و

(١) ( سەرچاوەی پێشوو / بەرگی ١ ، ل ٩٨١) .

(٢) ئەم زانیاریەم لە دەمی مامۆستا (فاروق ڕەسوڵ یەحیا) خۆیەوە بیست ، کە لە ڕۆژی چوارشەممە، بەرواری : (١١ / ٧ / ٢٠١٢) لە سەردانێکمدا بۆماڵەوەیان پێی ڕاگەیاندم.

(٣) (پوختەی چەند لایەنێکی ژیانی زانای گەورەی کورد سەعیدی نوورسی – نووسینی: فاروق ڕەسوڵ یەحیا / ل ٢٠) .

کۆچی ماڵئاوایی لەم دنیا فانییە کرد.

خوای گەورە و میهرەبان نوقمی ڕەحمەتی فراوانی خۆی بکات و بە بەهەشتی بەرین شادی بکات (ئامین) .

شایانی وتنە چەند مانگێك دوای کۆچی دوایی، کاربەدەستان لە گۆڕەکەی دەریان هێنا و لە شوێنێکی نەزانراودا ناشتیانەوە !

ئەوەی لێرەدا جێگەی سەرنجە ئەویش ئەوەیە : کە مامۆستا نوورسی پێش ئەوەی کۆچی دوایی بکات داوای لە خوا کردبوو کە گۆڕەکەی نەبێتە نەزرگای موسوڵمانان و بەهۆی هاتنە سەر گڵکۆکەی تووشی گوناه بن.

**١١) ئەو خزمەتە نایابانەی کە بە مامۆستا نوورسی کراوە لە دوای وەفات کردنی بریتین لە [1] :**

یەکەم : تا ئێستا لە (تورکیا) نۆ دانە کۆنگرەی جیهانی و دەیان کۆڕ و سیمیناری ناوخۆیی لەسەر ژیان و بیری مامۆستا نوورسی گیراوە.

هەروەها لەسەر ئاستی جیهانیش چەشنی (میصر و، مەغریب و، جەزائیر و، ئەردەن و، مالیزیا و، ئوستراليا و، ئەندۆنیسیا و، یەمەن و، چاد و، ئەڵمانیا و، بۆسنە و، فلیپین و، سوودان و، باشووری ئەفریقیا و، شوێنانی تریش ..) کۆنگرەی جیهانی و کۆڕ و سیمیناری زانستی لە ئاستە ئەکادیمیەکاندا لەسەر پێشکەش کراوە.

دووەم : لە کوردستانی عێراقیش هەتا ئێستا سێ سیمینار تایبەت کراوە بە مامۆستا نوورسی و پەیامەکانی، لە شارەکانی (هەولێر ، سلێمانی ، سۆران) .

سێیەم : تا ئێستا سێ مزگەوت بە ناویەوە ناونراوە لە شارەکانی (سلێمانی ، سۆران ، کەرکووك) .

---

(١) (پوختەی چەند لایەنێکی ژیانی زانای گەورەی کورد سەعیدی نوورسی ـ نووسینی: فاروق ڕەسوڵ یەحیا / ل ٢٠ ـ ٢٣) .

**چوارەم** : لە چەند زانکۆیەکی جیهاندا هەندێ بەرهەمی "مامۆستا نوورسی" لە ناوەندی مەنهەجە ڕەسمیەکان و سەرچاوە زانستییەکاندا دانراون و بە دەرس دەخوێندرێن، وەك : زانکۆی (ئەزهەری میصر) و، زانکۆی (محمد الخامس) لە مەغریب و، زانکۆی (ئیسلامی جیهانی) لە مالیزیا.

**پێنجەم** : وەرگێڕانی (پەیامەکانی نوور) [1] بۆ زۆربەی زمانەکانی جیهان لەوانە : (عەرەبی ، ئینگلیزی ، ئەڵمانی ، فەرەنسی ، ڕووسی ، ئۆردی ، فارسی ، ئیتاڵی ، کۆجاراتی ، مەلایا ، ڕۆمانی ، چینی ، بولگاری ، پورتوگالی ، ئەلبانی ، بۆسنی ، ئیسپانی ، مەقەدۆنی ، کوردی) هەروەها هەندێ زمانی تریش کە کۆی هەموویان تا ئێستا گەیشتووەتە پەنجا و دوو (٥٢) زمان.

**١٢) ئەو کتێبانەی کە لەسەر (سەعید نوورسی) نووسراون بە زمانی عەرەبی بریتین لە :**

**١- في ظلال رسائل النور - د. مأمون فريز جرار.**

**٢- سعيد النورسي رجل الإيمان في محنة الكفر والطغيان - د. أديب إبراهيم الدباغ.**

**٣- الإدراك الروحي بين التصوف والنورسي - مجموعة من الأساتذة.**

**٤- التربية السلوكية عند بديع الزمان النورسي- مجموعة من الأساتذة.**

---

(١) شایانی وتنە: یەکەم کەسێك کە هەوڵی وەرگێڕانی (پەیامەکانی نوور) یدا بۆ زمانی عەرەبی مامۆستا (مەلا عبدالله) ی برا گەورەی مامۆستا نوورسی بووە. پاشان یەکێك لە قوتابیەکانی مامۆستا نوورسی کە ناوی (لەفیف) بووە لە ساڵی (١٩٧٤ م) بەشێك لە پەیامەکانی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی. هەروەها مامۆستا (إحسان قاسم الصالحي) تەواوی (پەیامەکانی نوور) ی لە تورکیەوە وەرگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی.

٥- النورسي أديبا- مجموعة من الأساتذة.

٦- الجمالي في الفكر الإسلامي المعاصر- مجموعة من الأساتذة.

٧-فقه المقاصد والحكم- مجموعة من الأساتذة.

٨- من قضايا القرآن والإنسان في فكر النورسي- أ. د. زياد خليل الدغامين.

٩- المعنى القرآني في رسائل النور- أ.د. عشراتي سليمان.

١٠- الإسلام في تركيا الحديثة بديع الزمان النورسي- شكران واحدة.

١١- سؤال الأخلاق في مشروع النورسي.

١٢- التعليم في ضوء فكر النورسي- د. إبراهيم أبو محمد.

١٣- الصور والمرايا- أديب إبراهيم الدباغ.

١٤- البعد العقدي- د. الشفيع الماحي أحمد.

١٥- أسس الوحدة الفكرية- د. عبدالكريم عكيوي.

١٦- النورسي في رحاب القرآن- أ.د. عشراتي سليمان.

١٧- سيرة ذاتية مختصرة- إحسان قاسم الصالحي.

١٨- الأمثال في رسائل النور- د. الشفيع الماحي أحمد.

١٩- مقاصد رسائل النور- أ.د. عمار جيدل.

٢٠- رسالة الإجتهاد ، قراءة تحليلية - أ.د. قطب مصطفى سانو.

٢١- بحوث في الإعجاز والتفسير- د. أحمد خالد شكري.

٢٢- النورسي أديب الإنسانية - أ. د. حسن الام.

٢٣- الإمام النورسي والتعامل الدعوي مع القومي - د. ليث سعود جاسم.

٢٤- ذكريات عن سعيد النورسي - ترجمة : أسيد إحسان قاسم.

٢٥- ماهية الإنسان - د. عمار جيدل.

٢٦- في آفاق النور- أديب إبراهيم الدباغ.

٢٧- اصداء النور- أديب إبراهيم الدباغ.

٢٨- معالم التجديد عند النورسي- أ. د. محسن عبد.

٢٩- مفاتح النور - د. فريد الأنصاري.

٣٠- البديع الزمان النورسي سيمياء الشكل- أ.د. عشراتي سليمان.

٣١- النورسي وإثبات الحقائق الإيمانية - د. عمار جيدل.

**بە زمانی ڕەسەنی كوردیش ئەم بابەتانەی لەسەر نووسراوە:**

١- كورتە پێناسەیەكی پەیامەكانی نوور- حبيب محمد سعيد.

٢- چەند چەپكێ بیرەوەری سەبارەت بە مامۆستا سەعیدی نوورسی- نووسینی: أسيد إحسان قاسم / وەرگێڕانی: حبيب محمد سعيد.

٣- پوختەی چەند لایەنێكی ژیانی زانای گەورەی كورد (بديع الزمان سەعیدی نوورسی) - فاروق ڕەسوڵ یەحیا.

٤- چاكسازییەكانی سەعید نوورسی و هەڵوێستەكانی بەرامبەر بە دەسەڵاتدارانی توركیا - نووسینی: خالید دۆستی.

٥- پەیامی ڕۆح - نووسینی: د. خەدیجە نەبراوی / وەرگێڕانی: زانا ناجی.

### ١٣) هەندێ لە وێنەكانی پێشەوا نوورسی :



وێنەی مامۆستا سەعیدی نوورسی

كاتی هەڵهاتنی لە سەربازگەی دیلەكان لە ڕوسیا (١٩١٨ م)



وێنەی مامۆستا سەعیدی نوورسی

لە سەرەتای یەکەم جەنگی جیهانیدا



وێنەی مامۆستا سەعیدی نوورسی

لە سەرەتای ڕۆیشتنی بۆ بارلا



وێنەی مامۆستا سەعیدی نوورسی

لەگەڵ عبدالرحمن برازای



Bediuzzaman Said Nursi'nin Afyon mahkemesi arasında çekilmiş bir fotoğrafı.

وێنەی مامۆستا سەعیدی نوورسی

لە کاتی نوێژکردندا



[illegible] 1952 [illegible] Fatih Camiinin [illegible]







**وێنەی مامۆستا سەعیدی نوورسی**

**لە تەمەنی (٨٣)ساڵیدا و ساڵێ پێش وەفاتی**

**سەرچاوەکان:**

١. پوختەی چەند لایەنێکی ژیانی زانـای گـەورەی کـورد سـەعیدی نوورسـی / نووسینی: فاروق ڕەسوڵ یەحیا.

٢. سەردانێکی مەیدانی بۆ ماڵی مامۆستا ( فاروق ڕەسوڵ یەحیا ) کە لـە دیـاری کردنی نووسراوەکانی مامۆستا نوورسی زانیاری پێدام ( خـوای گـەورە پاداشتی بداتەوە و لەسەر کاری خێر بەردەوامی بکات ) .

٣. وتەکان / نووسینی : مامۆستا سەعیدی نوورسی - وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە بۆ کوردی: فاروق ڕەسوڵ یەحیا.

٤. بریسکەکاکان / نووسینی : مامۆستا سـەعیدی نوورسی - وەرگێڕانی لـە عەرەبییەوە بۆ کوردی: فاروق ڕەسوڵ یەحیا.

٥. تیشکەکان / نووسینی : مامۆستا سـەعیدی نوورسی - وەرگێڕانی لـە عەرەبییەوە بۆ کوردی: فاروق ڕەسوڵ یەحیا.

٦. پاشبەندەکان / نووسینی : مامۆستا سـەعیدی نوورسی - وەرگێڕانی لـە عەرەبییەوە بۆ کوردی: فاروق ڕەسوڵ یەحیا.

٧. چەند چەپکێ بیرەوەری سەبارەت بـە سـەعیدی نوورسی / ( أسید إحسان قاسم ) چەپکی کردوون و لە تورکیەوە کردوونی بە کوردی - ( حبیب محمد سعید ) یش لە عەرەبییەوە کردوونی بە کوردی / ساڵی چاپ ( ١٩٩٥ م ) .

٨. چاکسازییەکانی سەعید نوورسی / نووسینی ( خالید دۆستی ) .

٩. یەك دوو سەرچاوەی ئەنتەرنێت.

## پوختەیەك

## لە ژیاننامەی پێشەوا مەودودی



# پوختەیەك
# لە ژیاننامەی پێشەوا مەودودی



**١) ناوی تەواوی :**

ناوی (ئەبو ئەعلا) ی کوڕی سەید (ئەحمەد) ی کوڕی (حەسەن) ی مەودودی یە.

**٢) شوێنی لە دایك بوونی :**

ڕۆژی جومعە لە بەرواری (٢) ی ڕەجەبی ساڵی (١٣٢١) ی کۆچی بەرامبەر (٢٥ / ١١ / ١٩٠٣) ی زایین لە شارۆچکەی (جیلی بورە) نزیك شاری (ئورەنج ئاباد) کە سەر بە ولایەتی (حەیدەر ئاباد) ی باشوری وڵاتی هندستانە لە بنەماڵەیەکی موسوڵمان و ئیسلام پەروەر لە دایك بووە و چاوی بە دنیا هەڵهێناوە [١].

(١) ئەم مێژووە لە سایتی (المكتبة الشاملة) وەرگیراوە.

بەڵام لە ڕاستیدا ئەصڵ و بنەچەی (مەودودی) دەگەڕێتەوە سەر جەزیرەی عەرەب، چونکە باپیرە گەورەی کە ناوی شێخ (قطب الدين بن مودود) بووە نزیکەی هەزار ساڵ پێش ئێستا کۆچی کردووە بەرەو (جشت) ی نزیك شاری (هیرات) ی وڵاتی ئەفغانستان، کەلە بنەڕەتدا نەسەبیان دەگەڕێتەوە سەر پێشەوا (حسێن) ی کوڕی (عەلی) ، دواتر باپیرە گەورەی (ضواجه مودود) لە کۆتایی سەدەی نۆی هیجریدا چووەتە شارۆچکەی (برناس) کە دەکەوێتە باکوری ڕۆژئاوای (دەلهی) پایەتەختی (هیندستان) ە وە، وە دواتر لە زەمانی (شا عالیم) دا کەیەکێك بووە لە پادشاکانی مەغۆل لە (هیند) دا کۆچ دەکا بۆ (دەلهی) ، ئیتر لەوێ دەمێننەوە هەتا ئەوکاتەی سەید (ئەحمەد) ی باوکی (ئیمام مەودودی) کۆچ دەکا بۆ (ئورەنج ئاباد) کە دەکەوێتە باشوری هیندستانەوە [1] .






نەخشەی ئەفغانستان






نەخشەی هندستان

(١) (أبوالأعلى المودودي عصره، حياته، دعوته، مؤلفاته– تأليف: أليف الدين الترابي / ص ١١٦) .

## ٣) ناوی باوك و دایك و برا و خوشكەكانی :

### أ- باوكی:

ناوی سەید (ئەحمەد) ی كوڕی (حەسەن) ی مەودودی یە، ساڵی (١٨٥٠) ی زایین لە شاری (دەلهی) لەدایك بووە و، یەكێك بووە لە خوێندكارەكانی زانكۆی (علیكرة) كە (سیر سید أحمد خان) [1] دامەزرێنەری بووە. دوای ئەوەی كە یەكێ لە خزمە نزیكەكانی چاوی پێ دەكەوێ كە سەید (ئەحمەد) خەریكی یاری كاراتیە و پۆشاكی ئینگلیزی لەبەركردووە، پاشان ئەم هەواڵە بە باوكی دەگەیەنێ، دواتر باوكیشی بە پەلە سەید (ئەحمەد) ی لە زانكۆی (علیكرة) دەرهێنا و خستیە زانكۆی (ئالە ئاباد) ە وە تا لەوێ وانەی پارێزەری (مەحامات) بخوێنێت.

جا كاتێ سەید (ئەحمەد) خوێندنی تەواوكرد بووە مامۆستای (وەلی عەهد) لە ویلایەتی (دیوكەرە) و، بۆ ماوەی چەند ساڵێ لەوێ مایەوە و، كاتێ (وەلی عەهد) یش مرد ئیتر دەستبەجێ (دیوكەرە) ی بەجێ هێشت و ڕووی كردە كاری پارێزەری لە شارەكانی هندستان وەك (میرت) و (غازی ئاباد) و (بلّند شەهر) .

---

(١) (سید أحمد خان بهادر) لە (١٧ / ٨ / ١٨١٧) ی زایین لەدایك بووە و، لە (٢٧ / ٣ / ١٨٩٨) كۆچی دوایی كردووە، مامۆستایەكی فێرخوازی موسوڵمانی هیندی بووە، لە بنەچەدا نەسەبی دەگەڕێتەوە سەر ئیمام (عەلی كوڕی ئەبی تالیب) ، ساڵی (١٨٦٣) ی زایین دامەزرێنەری (جمعية علمية أدبية) بووە لە شاری (غازی بور) ە، هەروەها كاتێ چووە شاری (علیكرة) پەیمانگایەكی تەعلیمی دامەزراند لە (٢٤ / ٥ / ١٨٧٥) ی زایین، پاشان پەیمانگایە پێشەكەوتنی بەخۆیەوە بینیوە و بوو بە كوللیە بەناوی (الكلية الشرقية الأنجلو إسلامية) ، دواتر ناوی بوو بە زانكۆی (علیكرة) ، شایانی باسە تەئسیری حوكمڕانی مەغۆلەكان و فیكرەی ڕۆژئاوای لەسەر بووە، ئەویش بە نییەتی خزمەت كردن بە موسوڵمانانی هندستان.



**سید أحمد خان بهادر**

دواتر لەساڵی (١٨٩٦) ی زایین سەفەری کرد بۆ شاری (ئورەنج ئاباد) کە سەر بە ویلایەتی (حەیدەر ئاباد) ە بۆ کاری پارێزەری، پاشان لەوێ چاوی دەکەوێ بە شێخ (محی الدین خان) کە سەرۆکی (ئەنجومەنی قەزاء) بوو لە (ئورەنج ئاباد) ، ئیتر بەهۆی وەرع و تەقوای شێخ (محی الدین) ە وە ئەو فیکرە ڕۆژئاواییەی کە کەمێ کاریگەری لەسەری هەبوو وازی لێ هێناو بە تەواوی گەڕایەوە بۆلای خوا و توانی ڕێڕەوی ژیانی خۆی بگۆڕێ و، وە لەگەڵ کاری پارێزەرییەکەیدا دەستی دایە بانگەوازی ئیسلامی و بڵاوکردنەوەی ئایینی خوا، ئەم گۆڕانەش ڕێکەوتی ساڵ (١٩٠٠) ی زایین بەرامبەر (١٣١٨) هیجری بوو.

ئیتر لەدوای ئەوەی کە تەوبەی کرد و بەجوانی گەڕایەوە بۆلای خوا پارێزەری لە قەزییەیە نەدەکرد کە حەق نەبوایە، هەر بۆیە بەهۆی ئەم هەڵوێستەیەوە باری دەرامەتی زۆر لاوازبوو بە تەواوی نەیدەتوانی بژێوی خێزانەکەی دەربکات تا وای لێهات لە ساڵی (١٣٣٣) ی هیجریدا (ئورەنج ئاباد) ی بەجێ هێشت و ڕوویکردە (حەیدەر ئاباد) ئەو دەمەش باری تەندروستی زۆر تەواو نەبوو، وە بەرەو خراپی دەچوو، لەوێش تەنها شەش مانگ خۆی بۆ گیراو پاشان ئەوێشی بەجێ هێشت و ڕوویکردە شاری (بهوبهال) کە کوڕە گەورەکەی سەید (ئەبومحمد) ماڵی لەوێ بوو،

وە بەڕێوەبەری دەستگای شارەوانی (بهوبهال) بوو، پاشان تووشی شەلەل بوو، وە بەو جۆرە مایەوە لەلای (ئەبومحمد) ی کوڕی هەتا چوار ساڵ ، دواتر لە ساڵی (١٣٣٩) ی هیجری بەرامبەر (١٩٢٠) ی زایین کۆچی دوایی کرد و گەیشتەوە خزمەت خوای بەرز و باڵا [١].




شاری بهوبهال

**ب- دایکی :** ناوی (ڕوقیە بیغم) کچی (میرزا قوربان) ی کوڕی (عەلی بیك خان) ە، لە بنەچەدا دەگەڕێنەوە سەر (تورك) ەکان، باپیرە گەورەی (میرزا طولك بی) لە زەمانی (عالمگیر) کە یەکێك بووە لە پادشاکانی مەغۆلەکان لە وڵاتی هندستان هاتۆتە شاری (دەلهی) یەوە و لەوێ نیشتەجێ بووە.

باوکی (ڕوقیەخان) شاعیر و ئەدیب بووە و، یەکێ بووە لە قوتابیەکانی شاعیری گەورەی هیند (میرزا غالب) [٢] ، هەروەها خاوەن ئیمتیازی ڕۆژنامەی (مخزن الفوائد) بووە، کە ڕۆژنامەیەکی کۆن بووە و بە زمانی (ئۆردی) دەرچووە.

---

(١) (هەمان سەرچاوەی پێشوو/ ص ١١٧ ـ ١١٨).

(٢) ناوی (میرزا أسد الله خان) ە و، نازناوەکەشی (میرزا غالب) ە، ساڵی (١٧٩٧) لە شاری (ئاغرا) ی سەر بە ناوچەی (بنجاب) لە بنەماڵەیەکی موسوڵمان لە دایك بووە و، ساڵی (١٨٦٩) لە شاری (دەلهی) کۆچی دوایی کردووە ، یەکێکە لە شاعیرە گەورەکانی زمانی (فارسی) و (ئوردی) لە هندستاندا.



شاعیر میرزا غالب

(ڕوقیەخان) ئافرەتێکی خواناس و زاهید بووە و، هەمیشە یارمەتی هەژاران و بێ نەوایانی داوە و ، زۆر گرنگی بە پەروەردەکردنی منداڵەکانی داوە و ، هەروەها ئافرەتێکی بە ئەمەك بووە بۆ مێردەکەی و لە کاتەکانی دەست کورتی و هەژاریدا زۆر کۆمەکی بووە و پشتی تێ نەکردووە هەتا لە ژیاندا بووە. وە لەگەڵ هەردوو کوڕەکەی (أبوالخیر) و (أبوالأعلی) مەودودی لە هندستانەوە کۆچی کردووە بۆ (پاکستان) و لەگەڵ ئەواندا لە شاری (لاهور) نیشتەجێ بووە و لەوێ ماوەتەوە هەتا کۆچی دوایی کرد لە ساڵی (١٩٥٨) ی زاییندا [١] .

ج- **خوشکەکانی:** باوکی (مەودودی) خاوەنی دووژن بووە، لە هاوسەری یەکەمی دوو کوڕ و دوو کچی بووە و، لە هاوسەری دووەمیشی کە دایکی (مەودودی) یە دوو کوڕی بووە.

خوشکی یەکەمی کە دوای (أبوالقاسم) لە دایك بووە هەر بە منداڵی کۆچی دوایی کردووە و، خوشکی دووەمیشی شوی کردووە و خاوەنی چەند منداڵێکە [٢] .

د- **براکانی :** پێشەوا (مەودودی) لە بەرەی باوکی سێ برای بووە کە بریتین لە[٣] :

(١) (هەمان سەرچاوەی پێشوو/ ص ١١٨ ـ ١١٩) .

(٢) (هەمان سەرچاوەی پێشوو/ ص ١١٩) .

(٣) (هەمان سەرچاوەی پێشوو/ ص ١١٩ ـ ١٢٠) .

یەکەم: (أبومحمد) کە برا گەورەی بووە و، لە شاری (بهوبهال) ی پاکستان بەڕێوەبەری دەستگای شارەوانی (بهوبهال) بووە.

دووەم : (أبوالقاسم) هیچی لەبارەوە نازانین.

سێیەم : (أبوالخیر) بە سێ ساڵ لە (أبوالأعلی) بە تەمەنتر بووە و، لە ساڵی (١٩٠٠) ی زاییندا لە دایك بووە.

لە بارەی ئەم برایەوە پێشەوا مەودودی دەفەرموێ : لە ماڵی باوکما من منداڵە بچووکەکەیان بووم، برایەکم هەبوو سێ ساڵ لەخۆم گەورەتر بوو، جا ئەوەی کە بۆمان دادەنرا لە خواردن من بەشەکەی خۆم دەخوارد، بەڵام براکەم هەڵی دەگرت و لە کاتی پێویستدا دەیخوارد، وە ئەگەر پارەیان پێ بدایانایە ئەوە من خێرا خەرجم دەکرد، بەڵام براکەم هەڵی دەگرت و کۆی دەکردەوە بۆ شتێ کە گران بەهابێ، جا لەبەر ئەوە من زۆر جار دەمویست لە بەشەکەی ئەو بەرم و بیخۆم یا لە پارە کۆکراوەکەی بەرم و خەرجی بکەم، هەر بۆیە زۆر جار لەسەر ئەو ڕەفتارانەم دەبووە دەمە قاڵەمان، بەڵام زۆری نەدەخایەند و بەشی دەدام، وە سەرەتا وام دەزانی کە من بردوومەتەوە و توانیومە ئەو شتەی لێ بسێنم بەڵام دوایی بۆ من دەرکەوت کە نەخێر وانیە، بەڵکو ڕاستیەکەی ئەوە بوو کە براکەم منی خۆش دەویست و تەنها بۆ خۆشی ئەو ململانێیەی لەگەڵدا دەکردم.

(أبوالخیرالمودودی) دوای ئەوەی قۆناغی سەرەتایی لەسەر دەستی باوکی بەسەرکەوتوویی تەواوکرد ئیتر دەچێتە خوێندنگای (الفوقانیة) لە (ئورەنج ئاباد) ، بەڵام بەرلەوەی ئەم قۆناغە لە خوێندن تەواو بکات تەندروستی باوکی تێکدەچێ و تووشی شەلەل دەبێ لە ساڵی (١٩١٦) ی زاییندا، لەبەر ئەوە (أبوالخیر) ناچار دەبێ و هەستی بەرپرسیاریەتی وای لێدەکات کە خوێندن بەجێ بهێڵێ و ڕوو بکاتە کاروکەسابەت ، هەر بۆیە لە تەمەنی (١٨) ساڵیەوە کەوتە جموجۆڵی نووسین بۆ

گۆڤار و ڕۆژنامەکان، سەرەتا لە ساڵی (١٩١٨) دا لە ڕۆژنامەی (مەدینە) کە ڕۆژانە لە شاری (بجنور) دەردەچوو دەستی کرد بە نووسین، بەڵام زۆری نەخایاند دوای دوو مانگ وازی لەم ڕۆژنامەیە هێناو ڕوویکردە ڕۆژنامەی (تاج) ی هەفتانە، کە لە شاری (جبل بور) دەردەچوو، بەڵام بەداخەوە ئەم ڕۆژنامەیەش زۆری نەخایاند بۆ ماوەی چەند مانگێ دەرچوو ئیتر دوای ئەوە داخرا ، لەبەر ئەوە ناچار بوو وازی لە کاری ڕۆژنامەوانی هێناو ڕوویکردە (دار الترجمة العثمانية) لە (حەیدەر ئاباد) ، ئیتر لەوێ مایەوە هەتا ساڵی (١٩٤٨) ، دواتر کۆچی کرد بۆ پاکستان و لە شاری (لاهور) نیشتەجێ بوو هەتا کۆچی دوایی کرد لە (٢٨ / ٨ / ١٩٧٩) ی زایین ، وە هەر لە شاری (لاهور) یش بە خاك سپێردرا [1] .



زانکۆی عوسمانی

(١) (هەمان سەرچاوەی پێشوو/ ص ١٢٠) .

## ٤) شێوازی پەروەردەکردن و پێگەیاندنی ئیمام مەودودی [1]:

باوکی پێشەوا (مەودودی) هەر سووربووە لەسەر ئەوەی کە ئەخلاق و ڕەوشتی جوان فێری کوڕەکەی بکات، جا لێرەدا پێمان باش بوو کە ئەو هەوڵە پەروەردەییانەی باوکی بخەینە ڕوو کە لەگەڵ (مەودودی) کوڕیدا ئەنجامی داوە:

١- نەیهێشتووە لە کۆڵان و شەقام یاری بکات، بەڵکو لە ماڵەوە شوێنێکی بۆ خۆی و براکەی دیاری کردبوو کە لەوێدا پێکەوە یاری بکەن.

٢- بە بەردەوامی هەوڵیداوە لەگەڵ خۆیدا بێ، بە تایبەت کاتێ دەچوو بۆلای برادەرەکانی، چونکە لەو دانیشتانەدا باس و خواسی زانستی و ئەخلاقی لێ دەکرا.

٣- وە سەرگوزەشتە و مێژووی پێغەمبەران و مێژووی ئیسلامی بۆ دەگێڕایەوە و، هەروەها چیرۆکی ئەخلاقی بۆ دەگێڕایەوە کە ئەمانە هەمووی بوونە دروستکردنی کەسایەتی ئیمام مەودودی.

٤- وە ڕێگەی نەدەدا کە دەست بەرزبکاتەوە بۆ کەسانی لاواز و بێ دەسەڵات و، وە نەیدەهێشت کە ستەم و زوڵمیان لێ بکات. وە ئەگەر شتی وای لێ بوەشابایەتەوە یەکسەر سەرزەنشتی دەکرد و وانەی دادەدا، جا لەم بارەیەوە ئیمام مەودودی خۆی بۆمان دەگێڕێتەوە و دەفەرموێ: جارێکیان لە منالی خزمەتکارەکەیم دا، دواتر باوکم بەوەی زانی هەر بۆیە داوای لە منالەکە کرد کە ئەویش تۆڵەی خۆی بسێنێتەوە و لێم بداتەوە.

٥- پێنج فەرزە لەگەڵ خۆیدا دەیبرد بۆ مزگەوت و فێری نوێژی جەماعەتی دەکرد و ڕای دەهێنا لەسەر هاموشۆکردنی مزگەوت.

٦- پشتیوانی لێ دەکرد لەو کارە چاکانەی کە ئەنجامی دەدا و دەیکرد، ئەویش لەبەر ئەوەی کە زیاتر پابەندی کاری چاکە و خێرخوایی بێ و، وە سوور بێ

---

(١) (هەمان سەرچاوەی پێشوو/ ص ١٢٣ ـ ١٢٤).

لەسەر ئەو جۆرە کارانە و، متمانەی زیاتریشی بەخۆی بێت.

لەم بارەیەوە (أبوالخیر) ی برا گەورەی بۆمان دەگێڕێتەوە و دەڵـێ: جارێکیـان لە مزگەوت دەبێ لەگەڵ باوکمدا و بانگ بێژەکە لەوێ نابێ تـا بانگەکـەی بـدا، هـەر بۆیە باوکم لەو کاتەدا بە (ئەبوئەعلا) دەڵێ: هەستە کوڕم بڕۆ بانگەکەمان بـۆ بـدە، ئەویش خێرا دەچێ بانگەکەیان بۆ دەدا، ئـەو کاتـە (ئەبوئـەعلا) تەمـەنی لـە پێـنج ساڵی تێپەڕی نەکردبوو.

## ٥) قۆناغەکانی خوێندن و پلەی زانستی و لێهاتوویی [١] :

باوکی پێشەوا (مەودودی) هەر سووربوو لەسەر ئەوەی کە جارێ نەچێتە خوێندنگای حوکومی بۆ ئەوەی ئەخلاق و ڕەوشتی جوانی فێربکا و فێری ڕەوشتی ناپەسەند نەبێ، هەروەها دەگێڕنەوە کە باوکی نەیهێشتووە (مەودودی) بچێتە خوێندنگای ئینگلیزەکان و هەر خۆی لە ماڵەوە وانەی زمانی (ئۆردی) و (فارسی) و (عەرەبی) و (قورئانی پیرۆز) و (فەرموودە) و (فیقه) ی پێوتۆتەوە و بە جوانی فێری کردووە.

هەروەها مامۆستای بۆ گرتووە تا بەجوانی فێری بکەن و لەژێر چاودێری خۆیدا پەروەردەیەکی ئیسلامی وەربگرێ و لەڕێی ئیسلام و ئەخلاقی ڕاست و دروست لانەدات.

وە دەگێڕنەوە کە کەسێکی زۆر بلیمەت بووە و هەر لەو تەمەنی منداڵییەدا (موطأ) ی ئیمام مالیکی لەبەر کردووە.

هەروەها بەهۆی یارمەتی باوکی و هاموشۆی زۆری مزگەوتەوە هەر لە تەمەنی پێنج ساڵی دا زۆرێك لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزی لەبەر کردووە و، وە هەوڵیداوە وردە وردە زانستە ئیسیلامیەکان فێر ببێ و تیایاندا شارەزا ببێت.

هەروەها بەهۆی ئەو گرنگی پێدانەی بە زمانی عەرەبی پێشەوا (مەودودی) توانی لە تەمەنی سیانزە ساڵیدا کتێبی (الإسلام والإصلاح) ی شێخ (عبدالعزیز جاویش) لە زمانی عەرەبیەوە وەربگێڕێتە سەر زمانی (ئۆردی) ، کە ئەمەش سەرکەوتنێکی زۆر گەورە بوو بۆ (مەودودی) لەو تەمەنەدا.

---

(١) (هەمان سەرچاوەی پێشوو/ ص ١٢٦) .



شیخ عبدالعزیز جاویش

بەم شێوەیە پێشەوا (مەودودی) هەتا تەمەنی نۆ ساڵی لە ماڵەوە لەگەڵ باوكی و مامۆستاكانیدا لە خوێندنی وانە سەرەتاییەكاندا بەردەوام بوو، وەك : زانستی (صرف) و (نحو) و (زمانی عەرەبی) و (فقه) .

پاشان لە تەمەنی نۆ ساڵی چووە خوێندنگای (الفوقانیة) ی (ئورەنك ئاباد) و لەوێ بووە قوتابی.

پرۆگرامی خوێندنی ئەم قوتابخانەیە تێكەڵەیە بوو لە قۆناغی (ناوەندی) و (سانەوی) ، هەروەها بەئیزافەی وانەی زمانی (عەرەبی) و (فیقه) و (فەرموودە) و (منطق) كەخوێندنی ئەم وانانە ئیجباری بوو.

لە ساڵی (١٩١٤) كاتێ تەمەنی (مەودودی) گەیشتە پانزە ساڵان، هەر لەو خوێندنگایە پۆلی (مەولەوی) بەسەركەوتوویی بڕی، ئەم پۆلە لەگەڵ ئەو وانە سەرەدەمییانەی كە لە سانەوی دەخوێنران، ئەم وانە ئایینیانەشی تێدا دەخوێندران لە زانستی (منطق) دا كتێبی (المرقاة) دەخوێندرا و، لە زانستی (فقه) دا كتێبی (القدوري) دەخوێندرا و، لە زانستی (فەرموودە) دا كتێبی (سنن الترمذي) دەخوێندرا و، ئەمەش لەلایەن كۆمەڵێ مامۆستایانی بە توانا و خاوەن ئەزموون دەوترانەوە.

وەك وتمان كاتێ باوكی تووشی شەلەل بوو لەساڵی (١٩١٦) بۆ (١٩٢٠) ی

زاییندا بۆ پێشەوا مەودودی و (أبوالخیر) ی برای ساڵانێکی گران و ناڕەحەت بوو لە هەموو ڕوویەکەوە، چونکە باری گوزەرانیان تێکچوو و وازیان لە خوێندن هێناو ڕوویان کردە کاری ڕۆژنامەوانی، نووسینەکانیشی خۆیان لە پارێزگاری خیلافەی ئیسلامی و یەکێتی موسوڵماناندا دەبینیەوە، جا بۆ ئەو مەبەستە هەر لەو کاتەدا کتێبێکی نووسی بەناوی (النشاطات التبشيرية في تركيا) .

جا ئەو کاتەی لە ساڵی (١٩٢١) ی زاییندا چووە (دەلهی) و لەوێ لە ڕۆژنامەی (المسلم) بە خاوەن ئیمتیازی ڕۆژنامەکە دامەزرا، جارێکی تر دەرفەتی ئەوەی بۆ ڕەخسا کە بگەڕێتەوە سەر خوێندنەکەی و لەوێ لەگەڵ کاری ڕۆژنامەوانیەکەیدا سوود وەربگرێ لە زانستە ئاینیەکان لەلای مامۆستایان و زانایانی ئەو ناوچەیە، لەو زانستانەش :

زانستی (بلاغة) و (أدب العربي) و (منطق) و (فلسفة) و (علم الكلام) لەلای شێخ (عبدالسلام نیازی) ، لەو کاتەدا شێخ سەرۆکی (دار العلوم الأمينية) بوو لە (دەلهی) و، شارەزاش بوو لە زمانی (عەرەبی) و (فارسی) و (ئینگلیزی) و (ئەڵمانی) و (فەرەنسی) و (سنکستیری) و هەندێ زمانی تریش. شایانی باسە ئیمام مەودودی ئەم وانانەی لە پێش نوێژی بەیانیەوە دەخوێند.

هەروەها وانەی (فەرموودە) شی وەك : کتێبی (جامع الترمذي) و (الموطأ) و کتێبەکانی تری فەرموودەی لەلای شێخی محدث (إشفاق الرحمن الكاندهلوي) [1] خوێندووە و، هەروەها وانەی تەفسیر و فیقهیشی لەلای شێخ (شریف الله خان) خوێندووە، بەم شێوەیە ئیمام مەودودی لە خوێندن بەردەوام دەبێ هەتا ساڵی (١٩٢٨) ی زایین..

---

(١) ناوی: (إشفاق الرحمن) کوڕی (عناية الرحمن) حەنەفی کاندەهلەوی یە ، خاوەنی کتێبی (الطيب الشذي شرح جامع الترمذي) و ، (حاشية على سنن ابن ماجه) و ، (كشف الغطا عن وجه الموطأ) ە و، ساڵی (١٣٧٧) ی هیجری کۆچی دوایی کردووە.

جا کاتێ ڕۆژنامەی (المسلم) لە ساڵی (١٩٢٣) ی زاییندا لەلایەن حکومەتەوە داخرا ، ئیتر ئیمام مەودودی دەستە پاچە دانەنیشت بەڵکو خۆی خەریك کرد بە خوێندنەوە و دیراسەکردنی زانستە ئیسلامیەکان و ئاداب و زمانی عەرەبی و ، هەروەها دیراسە کردنی زمانی ئینگلیزی کە بە فەزڵی خوا توانی لە ماوەی چوار مانگدا بێ هەوڵی کەسانی تر زمانی ئینگلیزی فێر ببێ، هەروەها دەستی کرد بە دیراسەکردنی فەلسەفە و زانستی کۆمەڵایەتی تا بتوانێ بەراورد بکات لە نێوان ڕۆشنبیری ئیسلامی و ڕۆشنبیری ڕۆژئاوادا.

## ٦) ئیمام مەودودی و کاری ڕۆژنامەوانی [1] :

پێشەوا (مودودی) دوای ئەوەی تەندروستی باوکی تێکدەچێ و تووشی شەلەل دەبێ لە ساڵی (١٩١٦) ی زاییندا، لەبەر ئەوە خۆی و (أبوالخیر) ی برا گەورەی ناچار دەبن کە خوێندن بەجێ بهێڵن و ڕوو بکەنە کارو کەسابەت ، هەر بۆیە لە تەمەنی (١٥) ساڵیەوە کەوتە جموجۆڵی نووسین بۆ گۆڤار و ڕۆژنامەکان، سەرەتا لە ساڵی (١٩١٨) دا لە ڕۆژنامەی (مەدینە) کە ڕۆژانە لە شاری (بجنور) دەردەچوو لەگەڵ (أبوالخیر) ی برایدا دەستیان کرد بە نووسین، بەڵام زۆری نەخایاند دوای دوو مانگ وازیان لەم ڕۆژنامەیە هێناو ڕوویان کردە ڕۆژنامەی (تاج) ی هەفتانە، کە لە شاری (جبل بور) دەردەچوو، بەڵام بەداخەوە ئەم ڕۆژنامەیەش زۆری نەخایاند بۆ ماوەی چەند مانگێ دەرچوو ئیتر دوای ئەوە لەلایەن حکومەتەوە داخرا.

لە ساڵی (١٩٢١) ی زایین پێشەوا (مەودودی) ڕێیکەوتە (دەلهی) پایتەختی

---

(١) (هەمان سەرچاوەی پێشوو/ ص ١٢٧ ـ ١٢٨) .

هندستان، وە لەوێ چاوی کەوت بە موفتی ولاتی هندستان (کفایة الله) [1] و شێخ (ئەحمەد سەعید سحبان) ، کە ئەم دوو بەڕێزە لە گەورە زانایانی (جمعیة العلماء) ی هیندستان بوون، هەر لەوێ داوای لێکرا کە ببێتە خاوەن ئیمتیازی ڕۆژنامەکەیان کە (جمعیة العلماء) بە ناوی (المسلم) هەفتانە دەریان دەکرد، دواتر (مەودودی) بە داواکەیان ڕازی بوو، وە بەم شێوەیە بەردەوام بوون تا ساڵی (١٩٢٣) ، ئیتر پاش ئەو ساڵە، واتە ساڵی (١٩٢٤) (جمعیة العلماء) بڕیاریاندا ڕۆژنامەیە دەربکەن بەناوی (الجمعیة) و، پێشەوا مەودودیش ببێتە خاوەن ئیمتیازی ڕۆژنامەکەیان، بەم شێوەیە بەردەوام دەبێ تا کۆتایی ساڵی (١٩٢٩) ی زایین، ئیتر دوای ئەوە واز لە کاری ڕۆژنامەوانی دەهێنێت.

هەروەها شایانی وتنە: لەو ماوەیەدا پێشەوا مەودودی هەر خەریکی کاری ڕۆژنامەوانی نەبووە، بەڵکو خەریکی نووسین و وەرگێڕانی چەند کتێبێ بووە لەوانە:

١- نووسینی کتێبی (النشاطات التبشیریة في ترکیا) .

٢- وەرگێڕانی کتێبی (المجازر الیونایین فی سمرنا) لە زمانی ئینگلیزیەوە بۆ زمانی ئۆردی، ئەمەش لە ساڵانی (١٩١٨) بۆ (١٩٢٠) ی زایین.

٣- نووسینی کتێبی (مصدر قوة المسلم) لە ساڵی (١٩٢٥) ی زایین.

٤- نووسینی کتێبی (الجهاد في الإسلام) لە ساڵی (١٩٢٨) ی زایین.

دواتر بڕیاردەدا کە واز لە کاری ڕۆژنامەوانی بێنێ و خۆی تەرخان بکات بۆ

---

(١) ناوی تەواوی: (محمد کفایة الله) ی کوڕی (عنایة الله) ی کوڕی (فیض الله) حەنەفی دەهلەویە و، ساڵی (١٨٧٥) ی زایین لە شارۆچکەی (شاهجهانپور) لە دایك بووە و، ساڵی (١٩١٩) زایین (جمعیة العلماء بالهند) ی دامەزراندووە، زانایەکی ئایینی و شاعیرێکی موسوڵمان بووە و، بە موفتی (کفایة الله) ناسراوە و، بە ڕەگەز خەڵکی هیندستانە و، ساڵی (١٩٥٢) لەو شوێنەی لێی لەدایك بووە کۆچی دوایی کردووە.

کاری بانگەواز و دەعوەی ئیسلامی، بۆ ئەو مەبەستە دەچێتە شاری (حەیدەر ئابادی دەکەن) و لەوێ لەلای (أبوالخیر) ی برا گەورەی کە لە (دار الترجمة العثمانیة) کاری دەکرد دەمێنێتەوە و خۆی سەرقاڵ دەکات بە خوێندنەوە و دیراسەکردنەوە، ئەمەش لە ساڵی (١٩٢٨) بۆ (١٩٣٢) دا بووە.

وە لەم ماوەیەدا کە سەرقاڵی خوێندنەوە و دیراسەکردن بوو چەند کتێبێکی نووسی و وەرگێڕا بۆ زمانی (ئوردی) ، لەوانەی کە نووسیونی :

١- تأریخ السلاجقة.

٢- تأریخ الدكن.

**وە لەو کتێبانەش کە وەریگێڕان بۆ زمانی (ئوردی) بریتی بوون لە :**

١- تأریخ ابن خلكان (ئەو بەشانەی کە پەیوەندی بە فاتمیەکانەوە هەیە) .

٢- (الأسفار الأربعة) دانراوی شێخ (صدرالدین الشیرازی) لە زانستی فەلسەفەدا.


صدرالدین الشیرازی


ابن خلكان

**سەرپەرشتی کردنی گۆڤاری (ترجمان القرآن)** [١] :

ساڵی (١٩٣٢) ی زایین هەستا بە سەرپەرشتی کردنی گۆڤارێکی مانگانەی سەربەخۆ لە شاری (حەیدەر ئاباد) بەناوی (ترجمان القرآن) ، کە سەید (أبومحمد مصلح الدين) دەریدەکرد، ئەمەش بۆ ئەوە نەبوو کە بگەڕێتەوە سەر بواری ڕۆژنامەوانی ، بەڵکو تەنها بۆ ئەوە بوو کە لەڕێی ئەم گۆڤارەوە بانگەوازی ئیسلامی بڵاوبکاتەوە، کە بەڕاستی ئەم گۆڤارە دەورێکی باڵای هەبوو لە بڵاوکردنەوەی بزووتنەوەی ئیسلامی لە قارەی هیندستاندا.

کە ئەم ڕاستیەش لە ژمارە یەکی گۆڤارەکە (ترجمان القرآن) دا بە ڕوونی دیارە کە تێیدا نووسیویەتی: ((إن هذه المجلة تضع اليوم قدمها في طريق محفوف بالمصاعب والمحن، وتولى عبئها رجل يعترف بالحقيقة لا بالمجاملة بأنه ضعيف فاقد القيمة صفر اليدين، ولكنه على رغم وعورة الطريق استعد لحمل هذا العبء على يقين واضح بأن الله الذي نور قلبه بالإسلام، وخلق في نفسه حب الدعوة إليه هو الذي سوف يؤازره، وينصره بنصر من عنده ويمنحه الرسوخ في العلم والصحة في الفكر والسلامة في القلب والطهارة في النفس والسمو في الروح)) .

ئەو بابەتانەی کە لەم گۆڤارەدا بڵاوی کردنەوە بریتی بوون لە [٢] :

١- **عن الحضارة الغربية.**

٢- **الحضارة الاسلامية وأسسها ومبادئها ١٩٣٣م.**

٣- **الاسلام في مواجهة التحديات المعاصرة.**

٤- **مفاهيم اسلامية حول الدين والدولة.**

٥- **حقوق الزوجين.**

---

(١) (هەمان سەرچاوەی پێشوو/ ص ١٢٨ ـ ١٢٩) .

(٢) لە سایتی (من إعلام المسلمين) وەرگیراوە.

٦- حركة تحديد النسل.

٧- مبادئ الاسلام.

٨- الحجاب.

٩- أسس الاقتصاد بين الاسلام والنظم المعاصرة.

١٠- مشكلة الجبر والقدر.

١١- ملكية الأرض في الاسلام.

١٢- نظرية الاسلام السياسية.

١٣- موجز تاريخ تجديد الدين واحيائه.

١٤- المصطلحات الاربعة في القرآن.

١٥- منهج جديد للتعليم والتربية.

١٦- معضلات الانسان الاقتصادية وحلها في الاسلام.

**٧) هاوسەرگرتنی مەودودی :**

لە ساڵی (١٩٣٧) ی زایین کاتێک پێشەوا مەودودی لە (دەلهی) بوو، لە خێزانێکی ئایین پەروەری ئەوێ ، هاوسەری ژیانی خۆی دۆزییەوە بەناوی (مەحمودەی کچی نصیرالدین شەمسی) ، ماڵی (نصیرالدین) ی خەزووریشی هەر لە شاری (دەلهی) بوو، ئەمەش بەهۆی ئەو پەیوەندییەی کەلە نێوان دایکی ئیمام مەودودی و دایکی (نصیرالدین) دا هەبوو، لەو هاوسەرەی تەنها ناوی دوو مناڵیمان دەستکەوت، لەکچ ناوی: (حمیراء) مەودودیە و، لە کوڕیش ناوی: دکتۆر (أحمد فاروق) مەودودیە کە (دکتۆر بووە لە شاری «بفالو» ی ئەمریکا لە ساڵی ١٩٧٩) .

## ٨) هیجرەت کردنی پێشەوا مەودودی بۆ (دار الإسلام) [(١)] :

ساڵی (١٩٣٧) شاعیرو فەیلەسوفی ناودار (محمد إقبال) [(٢)] دەعوەتنامەیەکی ئاراستەی پێشەوا مەودودی کردبوو تا بێتە شاری (لاهور) بۆ ئەوەی لەوێ چاوی پێ بکەوێت، پێشەوا مەودودیش هەستا سەفەری کرد بۆ (لاهور) و لەوێ چاوی کەوت بە (محمد إقبال) ، لەو چاوپێکەوتنەدا (محمد إقبال) داوای لە پێشەوا مەودودی کردبوو کە (حەیدەر ئاباد) بەجێ بهێڵێ و ڕوو بکاتە شاری (بنجاب) بۆ ئەوەی پێکەوە هەوڵبدەن ئایینی ئیسلام بە خەڵکی بگەیەنن و ڕێنموییان بکەن بۆ

---

(١) (هەمان سەرچاوەی پێشوو/ ص ١٣١ ـ ١٣٢) .

(٢) ناوی تەواوی: (ئیقبال) ی کوڕی شێخ (نور محمد) ە ، لە بەرواری (٩ / ٢ / ١٨٧٧) ی زایین لە شارۆچکەی (سیالکوت) سەر بە پارێزگای (بنجاب) ی غەربی لەدایك بووە ، زمانی ئوردی و فارسی و عەرەبی بەباشی زانیوە و، دواتر بۆ تەواو کردنی خوێندن ڕوودەکاتە وڵاتی (ئەڵمانیا) و لەوێ لە زانکۆی (میونخ) شەهادەی دکتۆرا بە دەست دێنێ و، دواتر دەگەڕێتەوە بۆ (هندستان) و لەوێ بە کاری ئەدەبی و شیعرەوە خەریك دەبێ و پاشان دەبێتە سەرۆکی حیزبی (العصبة الإسلامية في الهند) و ، هەروەها یەکێ دەبێ لەو کەسانەی کە داوای دامەزراندنی وڵاتێکی ئیسلامی دەکا بۆ موسوڵمانان بەناوی (پاکستان) و جیابوونەوەی یەکجارەکی لە (هندستان) ، هەروەها لە بواری نووسیندا دەستێکی باڵای هەبووە و توانیویەتی لە بوارەکانی (ئابووری و سیاسەت و پەروەردە و فەلسەفە و فیکر) دا شت بنووسێ ، لە بەرهەمە چاپ کراوەکانیشی بریتین لە: [ رسالة المشرق (بيام مشرق) ، زبور العجم (زبور عجم) ، والآن ماذا ينبغي ان نفعل يا أممَ الشرق ، الفتوحات الحجازية (أرمغان حجان) ، جرس القافلة (بانك درا) ، أسرار معرفة الذات (أسرار خودي) ، رموز بيخودي (أسرار فناء الذات) ، مسافر ، جناح جبريل (بال جبريل) ، ضرب كليم (الكليم موسى) ]، لە بەرواری (٢١ / ٤ / ١٩٣٣) ی زایین کاتژمێر پێنجی سەر لە بەیانی کۆچی دوایی کردووە.

سەر ڕێگا ڕاستەکەی خوای موتەعال، جا بۆ ئەو مەبەستە پێشەوا مەودودی داواکەی (محمد إقبال) ی قبوڵ کرد و چووە گوندێکی نزیك شاری (بتانکوت) کە دواتر ناوی لێنرا (دار الإسلام) ، بە مەبەستی نیشتەجێ بوون و دروستکردنی مەرکەزێك بۆ بانگەواز و نووسینی چەند کتێبێك بۆ دیاریکردنی یاسای بەڕێوەبردنی حکومەتێکی ئیسلامی و پێگەیاندنی چەند کەسانێکی چاکەخواز و موصلیح بۆ سەرپەرشتی کردنی موسوڵمانان لە ڕووی فیکر و زانستەوە، وە بڕیاریش درا کە دکتۆر (محمد إقبال) هەموو ساڵێك بۆ چەند مانگێك لەو مەرکەزەدا بمێنێتەوە تا پێکەوە دەست بدەنە بانگەواز و بڵاوکردنەوەی ئایینی خوا بە وڵاتی هندستاندا و وریاکردنەوەی خەڵکی لە ئافاتی گومڕایی و دووریی لە خوای گەورە، هەر بۆیە کۆڵیان نەدا هەتا دامەزراندنی وڵاتی (پاکستان) و دروستبوونی دەوڵەتێکی ئیسلامی لەو وڵاتەدا.

ئەم کۆچ کردنەی ئیمام مەودودی بۆ گوندی (دار الإسلام) لە بەرواری (١٥ / ٣ / ١٩٣٨) ی زایینیدا بوو، بەڵام مانگ و نیوێکی نەخایاند دکتۆر (محمد إقبال) ی هاوڕێی کۆچی دوایی کرد کە دەکاتە ڕێکەوتی (٢١ / ٤ / ١٩٣٨) ی زایین ، جا بەهۆی کۆچی لەناکاوی هاوڕێی یارمەتیدەری ئەم یەك دێڕەی نووسی : ((فقدت أكبر سند لي في الدنيا بموت الدكتور محمد إقبال)) .





شاعیری ئیسلام/ محمد إقبال لاهوری

(أبوالخير) ی برای بۆمان دەگێڕێتەوە و دەڵێ [١] : ئەو کاتەی کە (محمد إقبال) داوای لێکرد کە بێتە ناو (بنجاب) ە وە، لە هەمان کاتدا (زانکۆی عوسمانی) لە (حەیدەر ئاباد) یش داوایان لێکردبوو کە ببێتە مامۆستا لە زانکۆکەیان بە ڕاتبێکی زۆر، بەڵام مامۆستا مەودودی ئەو داوایەی ڕەتکردەوە لە کاتێکدا کە باری ئابووری خێزانەکەشی زۆر باش نەبوو، هەر بۆیە زۆر هەوڵم لەگەڵی دا تا لەو زانکۆیە دامەزرێ و نەیەت بۆ (بنجاب) ، بەڵام کۆڵی نەداو لەسەر بۆچوونەکەی خۆی بەردەوام بوو، وە ئەو بەڵێنەی کە دابووی بە (محمد إقبال) بردیە سەرو چووە گوندێکی دوورە دەست کە ژیانی ڕەفایی و شارستانێتی تێدانەبوو بە ناوی (دار الإسلام) ، لەوێ مایەوە هەتا حاڵی حازر.



زانکۆی عوسمانی لە حەیدەر ئاباد

شایانی باسە پێشەوا مەودودی بەر لەوەی کۆچ بکا بۆ گوندی (دار الإسلام) لە گۆڤاری (ترجمان القرآن) دا بانگەوازێکی بۆ هەموو لایەك بڵاوکردەوە کە ئەویش بەمجۆرە بوو [٢] :

---

(١) (أبوالأعلى المودودي عصره، حياته، دعوته، مؤلفاته– تأليف: أليف الدين الترابي / ص ١٢١) .

(٢) (هەمان سەرچاوەی پێشوو/ ص ١٣٢ ـ ١٣٣) .

گوندی (دار الإسلام) گوندێکە ژیانی تاك و کۆمەڵی پێکەوە گرێداوە و لەسەر بناغەی ئایینی ئیسلام دەچێ بەڕێوە، جا هەرکەسێ ئەم پرۆژەیەی پێ خۆشە ئەوە دەتوانێ هیجرەت بکا بۆ گوندی (دار الإسلام) و بێتە پاڵ ئێمە و لێرە خزمەت بە ئیسلام بکات، جا ئەوکەسانەی کەئەم بانگەوازەیان قبوڵ کرد و چوونە گوندی (دار الإسلام) لەم قۆناغەدا بریتی بوون لە:

**١- شێخ (صدرالدین الإصلاحی) .**

**٢- شێخ (محمد صدیق) .**

**٣- سەید (محمد شاه) .**

**٤- شێخ (عبدالعزیز الشرقی) .**

**٥- مامۆستا (نعیم الصدیقی) .**

جا بۆ بڵاوکردنەوەی بناغەکانی ئایینی ئیسلام و تێگەیاندنی موسوڵمانان پێشەوا مەودودی لە گوندی (دار الإسلام) هەستا مزگەوتەکەی کرد بە شوێنی بانگەواز و، هەموو جومعەیەکیش وتاری جومعەی تێدا دەدا و مەسەلەکانی بیروباوەڕی ئیسلامی و مانا و حیکمەتەکانی تێدا ڕۆشن دەکردەوە بە شێوازێکی زۆر ئاسان و نایاب کە هەموو موسوڵمانێ لێی تێ بگات، وە دواتر ئەم وتارانە لە گۆڤاری (ترجمان القرآن) دا کە مانگانە دەردەچوو بڵاودەکرایەوە.

بەڵام زۆری نەخایاند دوای دە مانگ لەسەر ئەم شێوازە لە بانگەواز پێشەوا مەودودی و هاوەڵانی لەگەڵ خاوەن زەوییە وەقفەکەدا [1] جیاوازییان تێکەوت، خاوەن زەویە وەقفەکە بۆچوونی وابوو کە گوندەکە تەنها مەرکەزێك بێ بۆ

---

(١) شایانی وتنە: کاتی خۆی گوندی (دار الإسلام) و زەوییەکانی دەوروبەری هی پیاوێك بوو بەناوی (الشودري نیاز) کە وەقفی کردبوو لەسەر هاوڕێیەکی دکتۆر (محمد إقبال) بۆ خزمەتی ئایینی ئیسلام و بانگەوازەکەی.

وەرگرتنی زانست و زانیاری و تێگەیشتن لە بناغە و پایەکانی ئیسلام، پێشەوا مەودودی و هاوەڵانیشی بۆچوونیان وابوو کە گوندەکە ببێتە مەرکەزێك بۆ بزووتنەوەیەکی ئیسلامی، جا لە کۆتاییدا مامۆستا مەودودی و هاوەڵانی گەیشتنە ئەو بڕیارەی کە کۆچ بکەن بۆ شاری (لاهور) و لەوێ ئەو ئامانجەی خۆیان بهێننەدی و، گوندەکەش وەك خۆی بمێنێتەوە و ببێتە مەرکەزێکی تەعلیمی.

### ٩) هەوڵ و تێکۆشان بۆ دامەزراندنی کۆمەڵێکی ئیسلامی (١) :

هەر لە تەمەنی لاوێتیەوە ئیمام مەودودی حەزی بە چالاکی ئیسلامی و دروستبوونی کۆمەڵێکی ئیسلامی هەبووە ئەویش بەهۆی ئەو پەروەردە ئیسلامیەی کە لەماڵی باوکیدا کرابوو، هەر بۆیە لە ساڵی (١٩١٨) ی زایین کاتێ تەمەنی پانزە ساڵان بوو دەبیستێ کۆمەڵێك هەن بەناوی (بزووتنەوەی خیلافە) دەچێتە ڕیزەکانی ئەم بزووتنەوەیە و دەست دەکات بە چالاکی هەتا کۆتایی بزووتنەوەکە لە ساڵی (١٩٢٤) ی زایین.

لە دوای بڵاوکردنەوەی بانگەوازی ئیسلامی لە ڕێی گۆڤاری (ترجمان القرآن) ە وە بۆ ماوەی هەشت ساڵ، هەر بۆیە پێشوەختە بانگەوازێك بۆ هەموو لایەك بڵاودەکاتەوە بۆ دامەزراندنی (کۆمەڵێکی ئیسلامی) ، بۆ ئەو مەبەستە لە (١) ی شەعبانی ساڵی (١٣٦٠) ی کۆچیدا بەرامبەر (٢٥ / ٨ / ١٩٤١) حەفتاو پێنج کەس لە زانایان و مامۆستایان کۆدەبنەوە و ڕێکدەکەون لەسەر دامەزراندنی (جەماعەیەکی ئیسلامی) ، وە لە (٢) ی شەعبانی ساڵی (١٣٦٠) ی کۆچی بەرامبەر (٢٦ / ٨ / ١٩٤١) ی زایینی کۆمەڵی ئیسلامی (الجماعة الإسلامية في پاکستان) لە شاری (لاهور) دامەزرا و بە کۆی دەنگی برایانی ئەو دانیشتنە پێشەوا مەودودی بووە یەکەم ئەمیری جەماعەکە.

---

(١) (هەمان سەرچاوەی پێشوو / ص ١٣٥ ـ ١٣٩) .

**ئامانج لە دامەزراندنی ئەم جەماعەیە بە کورتی بریتی بوو لە:**

**یەکەم:** بەرپاکردنی چاکسازی لە ژیانی موسوڵمانانداا.

**دووەم:** گێڕانەوەی موسوڵمانان بۆ تێگەیشتنی سەلەفی صاڵح.

جا بۆ ئەو مەبەستە لە گۆڤارە سەربەخۆکەی خۆیەوە (ترجمان القرآن) داوای لە موسوڵمانانی هیندستان کرد کە بێنە ناو ئەم جەماعەیەوە و پێی وتن :

((لابد من وجود جماعة صادقة في دعوتها إلى الله، جماعة تقطع كل صلاتها بكل شيء سوى الله وطريقه، جماعة تتحمل السجن والتعذيب والمصادرة، وتلفيق الاتهامات، وحياكة الأكاذيب، وتقوى على الجوع والبطش والحرمان والتشريد، وربما القتل والإعدام، جماعة تبذل الأرواح رخيصة، وتتنازل عن الأموال بالرضا والخيار)) .



نارمی کۆمەڵی ئیسلامی پاکستان

دواتر پێشەوا مەودودی لە ساڵی (١٩٤١) بۆ (١٩٤٧) تەرکیزی خستە سەر چەند بابەتێکی گرنگ و هەستیار بۆ جەماعەکەی، کە ئەم قۆناغە ناونرا بە قۆناغی دروستبوون و خۆئامادەکردن و پەروەردەکردنی نەفس لەسەر بنەماکانی ئیسلام، هەر بۆیە پێداگری کرد لەسەر سێ شتی زۆر گرنگ :

**یەکەم:** پێگەیاندنی پیاوانێك کە دەبنە هەڵگری ئاڵای بزووتنەوەیەکی ئیسلامی تا بە جوانی خۆڕاگرین و نەسرەوین ئەگەرچی ڕێگەکەشیان قورس و گران بێت، وە هەروەها ژیان و هەڵسوکەوتیان موتابقی ئەو بانگەواز و بزووتنەوە ئیسلامیە بێت کە هەوڵی بۆ دەدەن و دەیگەیەنن.

**دووەم:** ڕێکخستنی جەماعە بە باشترین شێوە و شێواز تا بە تەواوی بەرگەی هەموو هەل و مەرج و بارو زروفێ بگرێ لەپێناو بانگەوازەکەدا.

**سێیەم:** دانان و نووسینی چەند کتێبێکی ئیسلامی گرنگ لە هەموو بوارە جیا جیاکانی ژیانی تاکەکەسی و ئیجتیماعیدا، ئەویش بە شێوازێ ی مۆدێرن و سەردەمیانە.

دواتر بارەگای سەرەکی (کۆمەڵی ئیسلامی) یان گواستەوە بۆ گوندی (دار الأسلام) ئەویش بە ڕەزامەندی خاوەن زەوییە وەقفەکە.

دواتر پێشەوا مەودودی لە کۆنگرەکانی ساڵانەی جەماعە و موناسەبەتەکانی تردا چەند لێدوان و وتار و بابەتێکی پێشکەش کرد و پاشان لە دووتوێی چەند کتێبێکدا بە چاپ گەیەنران کە بریتی بوون لە:

١- طريق الإسلام.

٢- الدين القيم.

٣- الأسس الأخلاقية للحركة الإسلامية.

٤- الجهاد في سبيل الله.

٥- شهادة الحق.

٦- الدعوة الإسلامية ومتطلباتها.

٧- دعوة الجماعة الإسلامية.

٨- الصلاح والفساد.

٩- عقوبة المرتد في الإسلام.

**نووسینی تەفسیری (تفهيم القرآن)[١] :**

هەروەها پێشەوا مەودودی بیری لە نووسینی تەفسیرێ کردەوە بۆ قورئان کە موسوڵمانان بتوانن جوانتر لێی تێبگەن و پەیڕەوی لێ بکەن، بۆ ئەو مەبەستە لە مانگی (٢) ی ساڵی (١٩٤٢) ی زایین دەستیدایە تەفسیرکردنی قورئان بەناوی (تفهيم القرآن) ، واتە شەش مانگ دوای دامەزراندنی کۆمەڵی ئیسلامی، دواتر بە فەزڵ و کەرەمی خوا لە دوای سیی ساڵ و چوار مانگ کە ڕێکەوتی (٢٤) ی (ربيع الثاني) ی ساڵی (١٣٩٢) ی هیجری بەرامبەر (٧ / ٦ / ١٩٧٢) ی زایین توانی ئەم تەفسیرە پڕ بەهرەیە تەواو بکات.

**بەرهەڵستی کردنی دوژمنانی ئیسلام و هەڵوێستێکی جوامێرانە لەلایەن مەودودییەوە[٢] :**

پارێزەرێکی بەناوبانگی پاکستان بەناوی (أ.ك. بروهي) پڕوپاگەندەیەکی بڵاوکردەوە و وتی: هەرکەسێ بتوانێ و بۆم بسەلمێنێ کە قورئان هەموو مەبادیئو پرەنسیپەکانی دەستووری لەخۆگرتووە ئەوە من وەك خەڵاتێ پێنج هەزار ڕوبیەی پێ دەدەم.

جا کاتێ حکومەت بەم هەواڵەی زانی خێرا خۆی گەیاندە ئەم پارێزەرەو لە خۆشیاندا کردی بە وەزیری (قانون و یاسا) .

بەڵام پێشەوا مەودودی هەستی بەو خەتەرەیە لەسەر ئیسلام کرد، زانی کە چ پیلانێکی ژەهراوی بەدوادا دێ هەر بۆیە بڕیاریدا کە کتێبێکی ناوازە لەم مەیدانەدا بنووسێ بەناوی (أسس الدستور الإسلامي في القرآن) ، هەروەها لەهەمان کاتدا

---

(١) (هەمان سەرچاوەی پێشوو / ص ١٦١) .

(٢) (هەمان سەرچاوەی پێشوو / ص ١٤١ ـ ١٤٢) .

لێدوان و وتارێکی دا لە (کەراتشی) پایتەخت لەژێر ناونیشانی (تدوين الدستور الإسلامي) ، دواتر کتێبی (أسس الدستور الإسلامي في القرآن) گەیشتە دەستی پارێزەر بروهی و ئەویش دانی نا بە گەورەیی قورئان و خاوەنەکەی و ئەو یاسا و ڕێسایانەی کەلە قورئاندا هاتووە و خوای گەورە دایناوە بۆ بەشەرییەت، هەروەها دانی نا بە فەزڵ و بیرمەندیی مامۆستا مەودودی دا کە توانیویەتی ئەم کتێبە لەژێر ڕۆشنایی قورئاندا بنووسێ و دەڵێ: ((**إنه قد عمل في باكستان مالم يستطع أن يعمل أي حزب من الأحزاب ، وعلى الشعب الباكستاني كله أن يعترف له بهذا الجميل**)) .

## ١٠) زیندانی کردنی پێشەوا مەودودی [١] :

لە سەروبەندی دامەزراندنی (حکومەتی پاکستان) لە ساڵی (١٩٤٧) ی زایین و، جەماعەی ئیسلامی بوون بە سێ دەستەوە:

**دەستەی یەکەم** : خۆیان تەرخان کرد بۆ بانگەوازکردنی خەڵکی هیندستان، ئەویش بە بانگەوازکردنی خەڵکە موسوڵمانەکە و ئەوانەش کە غەیرە موسوڵمانن، وە دەستیان کرد بە بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامە و گۆڤار و کتێب بە زمانە جۆراوجۆرەکانی هیندستان و، هەروەها کردنەوەی خوێندنگا و پەیمانگای ئیسلامی و، تێگەیاندنی موسوڵمانان و وەرگێڕانی (قورئانی پیرۆز) بە زمانە جۆراوجۆرەکانی هیندستان و تێکۆشان بۆ کۆکردنەوەی موسوڵمانان لە دەوری یەکتر.

**دەستەی دووەم** : خۆیان تەرخان کرد بۆ بانگەوازکردنی خەڵکی جامۆکشمیر، ئەم دەستەیەش لە هەوڵ و تێکۆشان و بانگەوازیاندا نەفسی ڕێگای دەستەی

---

(١) (هەمان سەرچاوەی پێشوو / ص ١٣٧ ـ ١٣٩) .

یەکـەمیان گرتەبـەر بـۆ بانگـەوازکردن و بـەهێزکردنی بیروبـاوەڕی موسـوڵمانانی جامۆکشمیر.

**دەستەی سێیەم** : خۆیان تەرخان کرد بۆ بانگەوازکردنی خەڵکی پاکسـتان، ئـەم دەستەیە کەوتنە خەمی دامەزراندنی دەوڵەتێکی ئیسلامی لەسەر ئەساسی (قورئان و سوننەت) .

بەڵام بەداخەوە زۆری نەخایاند دامەزرێنەری وڵاتی پاکستان (محمد علی جناح) لە ساڵی (١٩٤٨) ی زاییندا کۆچی دوایی کرد و، سەرکردەکانی پاکستانیش کەوتنە مقۆمقۆی ئەوەی کە لادەن لەو ڕێڕەوەی کە پاکسـتانی بـۆ جیابۆتـەوە کـە ئـەویش دامەزراندنی حکومـەتێکی ئیسـلامیە لەسـەر بناغـەی (قورئـان و سـوننەت) ، بـەڵام ناحـەزان و دوژمنـانی ئیسـلام نەیانهێشـت ئـەم ئامانجـە گەورەیـە بێتـەدی و موسوڵمانان بحەوێنەوە لە سایەی حوکمی ئیسلامدا، هەر بۆیە ئەو شـیوعیانەی کـە چوو بوونە ڕیزی (حیزبـی ڕابیطـەی موسـوڵمانان) ە وە و قادیانیـەکان و ناحـەزانی سوننەت کەوتنە پیلان گێڕان دژ بە جەماعەی ئیسلامی و لەناوبردنیان.





محمد علی جناح

ئەوە بوو حکومەت کەوتە بڵاوکردنەوەی تۆمەت و درۆودەلەسـە بـۆ جەماعـەی ئیسـلامی، یـەکێ لـەو بوختـان و درۆیانـە ئـەوە بـوو دەیـانوت: پێشـەوا مـەودودی وتوویەتی: جیهادکردن بۆ ڕزگـارکردنی (جامۆکشـمیر) حەرامـە و موسـوڵمانان نابـێ ئەو کارە بکەن.

بەڵام لەڕاستیدا خۆی وانەبوو بەڵكو پێشەوا مەودودی و جەماعەكەی هەوڵیاندا لەڕێی ڕادیۆو ڕۆژنامە و گۆڤارەكانیانەوە جیهاد ڕابگەیەنن بۆ ڕزگاركردنی برا موسوڵمانەكانیان لە جامۆ كشمیر، بەڵام حكومەت قەدەغەی كردن و نەیهێشت ئەو كارە بكەن تا بیانووی بەدەستەوە بێ و بیانخاتە زیندانەوە، هەر بۆیە حكومەت خۆی بۆ نەگیرا و لە بەرواری (٤ / ٨ / ١٩٤٨) ی زاییندا پێشەوا مەودودی و زۆرێك لە هاوڵاتی و یاریدەدەرانی دەستگیركرد و خستنیە كونجی زیندانەوە، وە ئازادی نەكردن هەتا بیست مانگ بەسەر زیندانی كردنیاندا تێنەپەڕی.

**بڕیاری لەسێدارەدانی پێشەوا مەودودی لەلایەن دەسەڵاتەوە**[1] :

دوا بەدوای ئەو ئاشوب و فیتنە طائیفیەی كە شاری (لاهور) ی گرتەوە لە ساڵی (١٩٥٣) دا جارێكی تر پێشەوا مەودودی دەستگیر كراو بەپەلە حوكمی لە سێدارەدانی درا بەسەرا بە تۆمەتی هەڵگیرساندنی فیتنەی طائیفی، بەڵام ئەو هەر سوور بوو لەسەر ئەوەی كە دانبنێ بە ئاوا تاوانێكدا و نكۆڵی كرد كە تاوانی ئاوای ئەنجام دابێ و هەوڵی لەو شێوەی دابێت، وە ئەوەشی ڕەتكردەوە كە داوای لێبوردن و عەفو لە دەسەڵات بكات، وە وتی: ((إن كانت تلك إرادة الله فإني أتقبلها بكل فرحة ، وإن لم يكتب لي الموت في الوقت الحاضر فلا يهمني ما يحاولون فعله فإنهم لن يستطيعوا إلحاق أقل ضرر بي)) .

هەروەها فەرموویووی: ((لا أسترحم أحداً سوى الله لأن أحكام الموت لا تصدر في الأرض وإنما تصدر من السماء)) .

دواتر بەهۆی زەختی ناوخۆی موسوڵمانانی پاكستانەوە و، هەروەها چەند كەسایەتی و موفتی و زانایانی جیهانی ئیسلامیەوە وەك: شێخ (محمد بشیر

---

(١) (هەمان سەرچاوەی پێشوو / ص ١٤٣ ـ ١٤٤) .

إبراهیمی الجزائری) و، شێخ (أمین الحسیني) موفتی فەلەستینی گەورە و سەرۆکی کۆنگرەی ئیسلامی و، شێخ (أمجد الزهاوي) موفتی عێراق و، (آیة الله محمد الخالص) موجتەهیدی شیعە لە عێراق و، شێخ (عیسی الأنصاري) بە نوێنەرایەتی هەموو حیزبەکانی ولاتی ئەندەنوسیا و، (ئیخوان موسلیمین) ی میصر و، موسولمانانی دانیشتووی (ئنگلتەرا) ، دەسەلاتداران حوکمەکەیان بۆ دابەزاند بۆ زیندانی هەتا هەتایی و، پاشان لە سالی (١٩٥٥) ی زاییندا بە تەواوی ئەو حوکمەشی لەسەر لابراو کۆتایی بە زیندان کردنەکەی هێنرا.


محمد بشیر إبراهیمی


شیخ أمین الحسینی


شیخ أمجد زهاوی


آیة الله محمد الخالصی


ئیخوان موسلیمین


مەرکەزی ئیسلامی لەئنگلتەرا

**پێشەوا مەودودی و سەفەری ماڵی خوا** [١] **:**

لە بەرواری (٣ / ١١ / ١٩٥٩) ی زایین پێشەوا مەودودی بواری بۆ ڕەخسا کە سەفەری ماڵی خوا بکاو چاوی گەشبێتەوە بەو شوێنانەی کە قورئانی پیرۆزی تێدا دابەزیوە و پێغەمبەری خوای تێدا ژیاوە، وە بۆ نووسینی تەفسیرەکەی سوودێکی زۆری لەم سەفەرەی بینی و لە تەفسیرەکەشیدا ڕەنگی داوەتەوە، هەروەها بواری بۆ ڕەخسا کە زۆر شوێنی تری مەملەکەی عەرەبی سعودی ببینێ و، وە سەردانی مەملەکەی هاشمی ئوردنی بکا و، هەروەها سەردانی وڵاتی (فەڵەستین) و، (سوریا) و، (میصر) بکات، هەروەها هەوڵی دابوو کە سەردانی وڵاتی (عێراق) یش بکات بەڵام کاربەدەستان ڕێیان پێ نەدابوو بچێتە خاکی (عێراق) ە وە.

**دەوری پێشەوا مەودودی لە دامەزراندنی چەند کۆمەڵە و دەزگایەکی ئیسلامی دا** [٢] **:**

**یەکەم:** پێشەوا مەودودی دەورێکی باڵای هەبوو لە دامەزراندنی (جمعية الجامعات الإسلامية) وەك ڕێکخراوێکی هەمیشەیی.

**دووەم:** دەورێکی باڵای هەبوو لە دامەزراندن و دانانی بەردی بناغەی (زانکۆی ئیسلامی) لە (مەدینەی منەوەرە) لە ساڵی (١٩٦١) ، هەر بۆیە لەو کۆبوونەوەیەدا پێشەوا مەودودی کرا بە ئەندامی ئەنجومەنی (زانکۆی ئیسلامی مەدینە) .

**سێیەم:** دەورێکی باڵای هەبوو لە دامەزراندنی (رابیطەی جیهانی ئیسلامی) لە وڵاتی (سعودیە) لە ساڵی (١٩٦٢) ی زاییندا، وە لەو کۆنگرەیەدا هەڵبژێردرا بە ئەندامی دەستەی دامەزرێنەری (رابیطەی جیهانی ئیسلامی) .

**چوارەم:** دامەزراندنی (جمعية الطلبة الإسلامية) .

---

(١) (هەمان سەرچاوەی پێشوو / ص ١٤٦) .

(٢) (هەمان سەرچاوەی پێشوو / ص ١٤٧) .

**هەڵوەشاندنەوەی جەماعەی ئیسلامی و دەستگیرکردنی پێشەوا مەودودی [1] :**

بەهۆی داواکردنی گۆڕانکاری لە دەستووری وڵاتدا بە دەستورێکی ئیسلامی و، هەروەها گۆڕینی ناوی دەوڵەت لە (پاکستان) ە وە بۆ (جمورية باكستان الإسلامية) و، گێڕانەوەی مافی بەشخوراوانی خەڵکی پاکستان و، هەڵبژاردنێکی شەفافانە لەلایەن کۆمەڵی ئیسلامی پاکستانەوە، حکومەت بە هەلی زانی کە گورزێکی کوشندە بدا لە جەماعەکە، هەر بۆیە لە بەرواری (٦ / ١ / ١٩٦٤) دا بڕیاریدا بە هەڵوەشاندنەوەی جەماعەکە و یاساغ کردنی لە وڵاتدا و، هەروەها دەستگیر کردنی پێشەوا مەودودی و چل کەس لە ئەندامانی شورای ئەو جەماعەیە، هەروەها داخستنی بنکە و بارەگاکانیان لەسەرجەم وڵاتدا و، دەسگرتن بەسەر هەموو موڵك و ماڵی جەماعەکەدا، جا بۆ ئەم مەبەستە لیژنەیەکی سەرپەرشتیاری دانا بۆ جێبەجێ کردنی ئەو بڕیارانەی کە لە دەرهەقی جەماعەکەدا دەرچووون، ئەمەش ناوی ئەوکەسانەیە کە لە لیژنەکەدا بەشداربوون و هیچ تانەیەکیان نەدا لە بڕیارەکە و بەوپەڕی پێخۆشحاڵیەوە جێ بەجێیان کرد :

**١- سید محمود :** ئەندامی لیژنە (ئەمە ئەوکەسەیە کە کاتی خۆی لەو لیژنە تایبەتەی کە ساڵی (١٩٥٣) بڕیاری لە سێدارەدانی دەرکرد بۆ پێشەوا مەودودی موستەشاری قانونی لیژنەکە بوو) .

**٢- شەهزادە عالمگیر :** ئەندامی لیژنە (ئەمە ئەوکەسەیە کە بڕیاری دەستگیرکردنی پێشەوا مەودودی و هاوکارانی دەرکرد بە سیفەتی بەڕێوەبەری دەزگای ئاسایشی وڵات) .

---

(١) (هەمان سەرچاوەی پێشوو / ص ١٥١) .

**بەرەنگاربوونەوەی حکومەت لە مەسەلەی بینینی مانگ و هاتنی جەژندا [1] :**

لە ساڵی (١٩٦٧) بۆ جاری چوارەم حکومەت بڕیاری دەستگیرکردنی پێشەوا مەودودی دا لەبەر بەرهەڵستی کردنی حکومەت لە دیاری کردنی جەژنی ڕەمەزاندا بەبێ گەڕانەوە بۆ بینینی مانگ، چونکە حکومەت بڕیاری دابوو کە یەکەم ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان دەکەوێتە ڕۆژێ پێش بینینی مانگی یەکشەوە، بەڵام پێشەوا مەودودی ئەو بڕیارەی حکومەتی بە ناشەرعی لە قەڵەمدا و داوای کرد کە بەپێی بینینی مانگ جەژن ڕابگەیەنن نەك بە ئارەزووی خۆیان، هەر بۆیە حکومەت ئەم بەرهەڵستیەی مەودودی قبوڵ نەکرد و بڕیاری دەستگیرکردنی داو خستیە بەندیخانەوە بۆ ماوەی دوو مانگ، لەوەودوا بەناچاری ئازادی کرد.

**وازهێنان لە ئەمیری (جەماعەی ئیسلامی پاکستان) [2] :**

لە بەرواری (٤ / ١١ / ١٩٧٢) ی زایین پێشەوا مەودودی بەهۆی نەخۆشی و باش نەبوونی باری تەندروستی و خۆ یەکلایی کردنەوە بۆ تەواوکردنی کتێبی (سیرە) کەی وازی لە پۆستی ئەمیری جەماعەکە هێناو، بۆ پڕکردنەوەی شوێنەکەشی مامۆستا (طفیل محمد) کرا بە ئەمیری جەماعەکە.

**بەخشینی مەدالیای (مەلیك فەیصەڵ) بە پێشەوا مەودودی [3] :**

لە ساڵی (١٣٩٩) ی کۆچی جائیزەی (مەلیك فەیصەڵی جیهانی) ی پێدرا وەك ڕێزلێنانێك بەهۆی ئەو هەموو هەوڵ و تێکۆشانەی کە کردوویەتی لە پێناو خزمەتی ئیسلام و موسوڵماناندا، کە ئەو خەڵاتە بریتی بوو لە صەد هەزار ڕیاڵی سعودی و

---

(١) (هەمان سەرچاوەی پێشوو / ص ١٥٤) .

(٢) (هەمان سەرچاوەی پێشوو / ص ١٦١) .

(٣) (هەمان سەرچاوەی پێشوو / ص ١٦١ ـ ١٦٢) .

مەدالیایەکی ئاڵتونی، بەلاّم پێشەوا مەودودی ئـەم خەلاّتـەی بـۆ خـۆی هەڵنـەگرت، بەڵکو بڕیاری دا کە بیبەخشێ بە (مجمع المعـارف الإسـلامیة) کەلـە شـاری (لاهـور) بـوو، تـا بتوانـێ پێداویسـتیەکانی خـۆی دابـین بکـا و سـوودی لێ وەربگـرێ، وە فەرمووبووی: ئەم خەلاّتەی کە پێمدراوە لەبەر خزمەت کردنم بووە بە ئیسلام لەبەر ئەوە دروست نیە کە خەرج بکرێ ئیللا لە خزمەتی کردنی ئیسلامدا نەبێ.





مەلیك فەیصەڵ کوڕی عبدالعزیز

### ١١) دانراوو نووسینەکانی مەودودی [(١)]:

بێگومان ئەم پێشەوا مەزنە خوای گەورە توانایەکی سەیر و سەمەرەی پێ بەخشیبوو لە نووسیندا، وە هەرکەسێ چووبێتە ناو نووسینەکانیەوە ئەم ڕاستیەی بۆ دەرکەوتووە، جا ئێمە بە کورتی ئاماژە بەو خەصڵەت و تایبەتمەندیانە دەکەین کەلە نووسینەکانی پێشەوا مەودودی دا بەدی دەکرێت :

١- بە زۆری پشتی بە بەڵگەی (قورئان و سوننەت) دەبەست بۆ قەناعەت پێ هێنانی خوێنەران و موسوڵمانان، هەروەها بەڵگەی زانستی و گومان بڕ.

٢- هێنانی بەڵگە زانستی و عەقڵییەکان لەلایەن (مەودودی) یەوە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ڕۆژانە هەموومان بەو شتە حسسیانەدا تێدەپەڕین و هەستی پێ دەکەین و کاریگەری لەسەرمان هەیە.

٣- خوای گەورە دڵسۆزییەکی بێ وێنەی پێ بەخشیبوو هەربۆیە قسە و نووسینەکانی کاریگەری تەواویان هەبوو لەسەر نەفس و دڵی ئەوکەسانەی کە خوێندوویانەتەوە.

٤- خۆی بەدوور گرتووە لە وشە و (مصطلحات) ی زانستی کە تەنها زانایانی بواری خۆی لێی تێ دەگەن، چونکە بانگەوازەکەی بۆ هەموو خەڵکیە و نابێ لێی تێ نەگەن.

٥- هەر کاتێ ویستبێتی لەبابەت شتێکەوە بنووسێ ئەوە چووە دیراسەی هەموو ئەو کتێبانەی لە کۆن و تازەدا لەو بارەوە کردووە ئنجا ئەو شتەی نووسیوە، ئەمەش وای کردووە کە نووسینەکانی لە نووسەرەکانی تر جیاوازتر بێت.

---

(١) (أبوالأعلى المودودي عصره .. حياته .. دعوته .. مؤلفاته / تأليف : أليف الدين الترابي / الفصل الرابع ، ص ٢١٢ ـ ٢٥٧) .

٦- هەوڵیداوە ئەو کتێبانەی کە دەیان نووسێت قەبارەی کەم و پڕمانابێ ، بۆ ئەوەی هەم ئاسانکاری بێ لە کاتی چاپ و بڵاوکردنەوەدا، وە هەم ئاسان بێ بۆ خوێنەران لە کاتی خوێندنەوەیدا.

٧- لە نووسینەکانیدا وردبینی و دیققەتی زۆری تێدا کردووە تا لە هەڵەو کەموکوڕی دووربێ و، هەروەها گرنگیەکی زۆریشی بە بابەتەکانی داوە تا بەتەواوی ئامانج و مەبەستەکانی بێنێتەدی کە بڵاوکردنەوەی ڕێبازی ئیسلامە.

جا بۆ زیاتر تێگەیشتن لە نووسینەکانی پێشەوا مەودودی پێمان باش بوو هەر کتێبە لە شوێنی تایبەتی خۆیدا باسبکرێ و تەصنیفیش بکرێن :

**یەکەم: ئەو کتێبانەی کەلە بابەتی (تەفسیر و فەرمووده) دا نووسیونی :**

١- **تفهيم القرآن** : ئەم کتێبە بریتیە لە تەفسیری قورئان کە ماوەی سی ساڵی خایاندووە (١٩٤١) دەستی پێکردووە و (١٩٧٢) کۆتایی پێهێناوە، لە شەش (جوزء) پێکهاتووە. لەم تەفسیرە تەنها سورەتی (الفاتحة) و (البقرة) و (آل عمران) وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبی.

٢- **ترجمة القرآن** : بریتیە لە وەرگێڕانی قورئان بە زمانی ئوردی، ساڵی ١٩٧١ دەریکردووە.

٣- **مباديء أساسية لفهم القرآن** : بریتیە لە پێشەکییەك بۆ تەفسیرەکەی (تفهيم القرآن) کە سەربەخۆ بەچاپ گەیەنراوە و، دواتر لە ساڵی (١٩٦٨) ی زایین لەلایەن مامۆستا (خليل الحامدی) یەوە وەرگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی.

٤- **تفسير سورة النور**: مامۆستا (عاصم الحداد) وەریگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی.

٥- **القرآن والسنة** : بریتیە لەو نووسینانەی کە لە سەرەتای بانگەوازیەوە

هەتا ساڵی (١٩٥٣) ی زایین کە لە دیفاع لە سوننەدا نووسیویەتی و، هەروەها ئەو پەیوەندیانەی کەلە نێوان قورئان و سوننەدا هەیە.

٦- **فضائل القرآن** : ئەم کتێبە ساڵی (١٩٧٧) بە چاپ گەیەنراوە.

٧- **المصطلحات الأربعة في القرآن: الإله - الرب - العبادة - الدين**: ساڵی (١٩٤١) نووسیویەتی ، ئەم کتێبە وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبی و زمانی کوردیش.

٨- **كتاب الصوم** : بریتیە لەو وانانەی کە لەسەر کتێبی (مشكاة المصابيح) بە دەرس وتویەتیەوە، وە مامۆستا (حفيظ الرحمن الحسن) هەستاوە بە ئامادەکردنی و بە چاپی گەیاندووە لە ساڵی (١٩٧٣) .

٩- **مكانة السنة في التشريع** : ساڵی (١٩٦٣) ئەم کتێبەی لە دژی (حركة إنكار حجية السنة النبوية) نووسیوە، ئەم بزوتنەوەیە بڕوایان وایە کە سوننەت وەك بەڵگە لە تەشریعدا بەکارناهێنرێ و پشتی پێ نا بەسترێ.. تا ئێستا نەکراوە بە عەرەبی.

١٠- **تفهيم الحديث** : بریتیە لە مەوسوعەیەکی زۆر گەورە لە (فەرموودەکانی پێغەمبەر) کە لە تەفسیرەکەی و سەرجەم کتێبەکانی تری وەرگیراون، لەلایەن (مجمع المعارف الإسلامية) وە کۆکراونەتەوە و بەچاپ گەیەنراون.





**مامۆستا خليل الحامدى**

**دووەم: ئەو کتێبانەی کە لە بابەتی (سیرەی نەبەوی) دا نووسیونی :**

١- **سیرة سید العالم** : بریتیە لە مەوسوعەیەکی زۆر گەورە کە هەموو ئەو کتێب و نامیلکانە دەگرێتە خۆ کە لەبارەی (ژیانی پێغەمبەر) ە وە نووسیونی، ساڵی (١٩٧٠) دەستی پێکردووە و دواتر لە یەك دوو بەشی لێ بەچاپ گەیەنرا هەتا ساڵی (١٩٧٢) و، بەشی یەکەم : باس لە مەبادیئە ئەساسیەکانی بابەتی سیرە دەکا و، بەشی دووەمیش: باس لە سەردەمی مەککی دەکا و، بەشی سێیەمیش: باس لە سەردەمی مەدینەوە دەکات، بەشی یەکەم و دووەمی وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبی، بەڵام بەشی سێیەمی تا ئێستا نەکراوە بە عەرەبی.

٢- **النبوة المحمدية في محكمة العقل** : بریتیە لە کتێبێکی بچووك کە باس لە ڕاستێتی پێغەمبەرێتی (محمد) دەکا بە بەڵگەی عەقڵی تا جیلی نوێ قەناعەت پێ بێنێ، ساڵی (١٩٣٧) بە زمانی (ئوردی) بە چاپ گەیەنراوە و، دواتر مامۆستا (خليل الحامدی) لە ساڵی (١٩٧٨) دا کردوویەتی بە عەرەبی.

٣- **رسالة السيرة النبوية** : بریتیە لە نامیلکەیەکی بچوك ساڵی (١٩٧٦) بە چاپ گەیەنراوە.

٤- **سيرة الرسول** : بریتیە لە نامیلکەیەکی بچوك ساڵی (١٩٧٠) بە چاپ گەیەنراوە.

٥- **سيرة خاتم المرسلين** : بریتیە لە نامیلکەیەکی بچوك ساڵی (١٩٧٦) بە چاپ گەیەنراوە.

٦- **السيرة الطاهرة** : بریتیە لە نامیلکەیەکی بچوك ساڵی (١٩٧٨) بە چاپ گەیەنراوە.

٧- **القرآن والرسول** : بریتیە لە نامیلکەیەکی بچوك ساڵی (١٩٥٤) بە چاپ گەیەنراوە.

٨- **سيد العالم** : بريتيه لە ناميلەكەيەكى بچوك كە كۆمەڵە باسێك بووە لە ڕاديۆ پێشكەشى كردوون، ساڵى (١٩٤١) بە چاپ گەيەنراوە.

**سێيەم: ئەو كتێبانەی كەلە بابەتی (بيروباوەڕی ئيسلامی و بناغەی ئايين) دا نووسيونی:**

١- **مبادئ الإسلام** : ساڵى (١٩٣٧) نووسيويەتی، وەرگێڕدراوەتە سەر زمانى عەرەبى.

٢-**الخطب** : بريتيە لەو وتارانەی كەلە ڕۆژی جومعەدا لە ساڵى (١٩٣٨) دا لە گوندی (دار الإسلام) دا وتويەتی، دواتر لە دوو توێی كتێبێكدا لە ساڵى (١٩٤٠) دا بەناوی (الخطب) بەچاپی گەياندووە، بابەتەكانيشی بريتی بوون لە: باسی حەقيقەتی ئيمان و ئيسلام و نوێژ و زەكات و ڕۆژو و حەج و جيهاد.

٣- **نظرة فاحصة على العبادات الإسلامية** : ساڵى (١٩٣٩) نووسيويەتی.

٤- **حطب الحرم الشريف** : بريتيە لەو وتارەی كە لە سەفەری حەجدا لە حەرەمی مەككەدا وتويەتی لە ساڵى (١٩٦٣) دا.

٥- **الإسلام والجاهلية** : ناميلكەيەكى بچوكە، بريتيە لە وتارێك كە لە (الكلية الإسلامية) لە (پيشاوەر) وتويەتی لە ساڵى (١٩٤١) دا، وەرگێڕدراوەتە سەر زمانى عەرەبى.

٦- **طريق السلام** : بريتيە لە وتارێك كە وتويەتی لە ساڵى (١٩٤٠) دا، دواتر وەرگێڕدراوەتە سەر زمانى عەرەبى.

٧- **الحضارة الإسلامية ، أسسها ومبادئها** : ساڵى (١٩٣٣) نووسيويەتی، دواتر لەلايەن (دار الخلافة للطباعة والنشر) وە وەرگێڕدراوەتە سەر زمانى عەرەبى.

٨- **الدين الحق** : بريتيە لە وتارێك كەلە (الجامعة الملية) لە (دەلهی) وتويەتی لە ساڵى (١٩٤٣) دا، دواتر لەلايەن (مؤسسة الرسالة) وە لە (بەيروت) وەرگێڕدراوەتە سەر زمانى عەرەبى.

٩- **البعث بعد الموت** : بریتیە لە نامیلەکەیەکی بچوك کە کۆمەڵە باسێك بووە لە ڕادیۆ پێشکەشی کردوون لە ساڵی (١٩٤١) دا، دواتر لەلایەن مامۆستا (خلیل الحامدی) یەوە لە ساڵی (١٩٧٨) دا وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبی.

١٠- **مسألة الجبر والإختيار** : ساڵی (١٩٣٣) لە بەرپەرچی یەکێ لە سەرکردەکانی (حرکة جحود حجية السنة النبوية) دا نووسیویەتی کەناوی (الشودری غلام أحمد برويز) ە.

١١- **في محكمة العقل**: بریتیە لە و بابەتانەی کە نووسیونی لەبارەی (التوحيد، الرسالة، البعث، مسألة الجبر والإختيار) لەلایەن مامۆستا (خلیل الحامدی) یەوە کۆکراونەتەوە و کراون بە عەرەبی و پاشان بە چاپ گەیەنراون.

١٢- **برالأمان** : وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبی.

**چوارەم: ئەو کتێبانەی کەلە بابەتی (بانگەوازی ئیسلامی و پێویستیەکانی) دا نووسیونی :**

١- **الدعوة الإسلامية ومتطلباتها** : بریتیە لە کۆمەڵە وتارێك کەلە (کۆنگرەی ساڵانەی کۆمەڵی ئیسلامی) دا پێشکەشی کردووە، ساڵی (١٩٤٥) بەچاپ گەیەنراوە، دواتر لەلایەن مامۆستا (خليل الحامدي) یەوە وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبی، وە کتێبی (تذكرة دعاة الإسلام) ی لەگەڵدا چاپ کراوە.

٢- **دعوة الجماعة الإسلامية** : بریتیە لە وتارێك کە لە (کۆنگرەی کۆمەڵی ئیسلامی) دا پێشکەشی کردووە، ساڵی (١٩٤٧) بەچاپ گەیەنراوە.

٣- **الأسس الأخلاقية للحركة الإسلامية** : بریتیە لە وتارێك کە لە (کۆنگرەی کۆمەڵی ئیسلامی) دا پێشکەشی کردووە، ساڵی (١٩٤٥) بەچاپ گەیەنراوە، دواتر لەلایەن (الإتحاد العام لطلاب مصر) وە وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبی.

٤- **تجديد الدين وإحيائه** : ساڵی (١٩٤٠) نووسیویەتی.

٥- **شهادة الحق** : بریتیە لە وتارێك كە لە (كۆنگرەی كۆمەڵی ئیسلامی) دا پێشكەشی كردووە، ساڵی (١٩٤٦) بەچاپ گەیەنراوە، دواتر لەلایەن (مؤسسة الرسالة) وە لە (بەیروت) وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبی.

٦- **الصفات اللازمة للعاملين في مجال الدعوة الإسلامية** : بریتیە لە وتارێك كە لە (كۆنگرەی گشتی كۆمەڵی ئیسلامی) دا پێشكەشی كردووە، ساڵی (١٩٥١) بەچاپ گەیەنراوە، دواتر لەلایەن مامۆستا (خليل الحامدي) یەوە وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبی، وە كتێبی (تذكرة دعاة الإسلام) ی لەگەڵدا چاپ كراوە.

٧- **الشروط اللازمة لنجاح الحركة الإسلامية** : بریتیە لە وتارێك كە ئاڕاستەی ئەوكەسانەی كردووە كە لە (بواری بانگەوان) دا خەریكن، ساڵی (١٩٦٧) بەچاپ گەیەنراوە.

٨- **واقع المسلمين وسبيل النهوض بهم** : بریتیە لە وتارێك كە لە (كۆنگرەی كۆمەڵی ئیسلامی) دا ساڵی (١٩٥١) پێشكەشی كردووە، دواتر لەلایەن مامۆستا (عاصم الحداد) [1] وە كراوە بە عەرەبی و لەلایەن (مؤسسة الرسالة) لە (بەیروت) بەچاپ گەیەنراوە.

٩- **الجماعة الإسلامية - هدفها ، تأريخها ، وبرنامجها** : ساڵی (١٩٥١) نووسیویەتی.

---

(١) ناوی (محمد) ی كوڕی (عاصم) حدادی یە و، یەكێكە لەوكەسانەی كە بەپێی توانا هەوڵیداوە كتێبەكانی (ئیمام مەودودی) لە زمانی (ئوردی) یەوە وەرگێڕێتە سەر زمانی عەرەبی، لەوانەی كە وەریگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی بریتین لە: { ١- الربا : ١٩٥٨، ٢- الحياة بعد الموت ، ٣- مبادئ الاسلام : ١٩٥٧ ، ٤- اسس الاقتصاد بين الاسلام والنظم المعاصرة ومعضلات الاقتصاد وحلها في الاسلام: ١٩٧١ ، ٥- نظام الحياة في الاسلام: ١٩٥٨ ، ٦- تفسير سورة النور، ٧- مسألة ملكية الارض في الاسلام: ١٩٦٩ ، ٨- واقع المسلمين وسبيل النهوض بهم: ١٩٥٦}.

١٠- **دور المرأة المسلمة في الحركة الإسلامية** : بریتیە لە وتارێك كە لە (كۆنگرەی خوشكان) دا بەسەرپەرشتی (كۆمەڵی ئیسلامی) پێشكەشی كردووە لە ساڵی (١٩٤٨) .

١١- **مصدر قوة المسلم** : ئەم كتێبەی لە ساڵی (١٩٢٥) دا نووسیوە كاتێ تەمەنی (٢٢) ساڵ بووە، دواتر بۆ یەكەمجار لە ساڵی (١٩٦٩) بە چاپ گەیەنراوە.

١٢- **ماهي الدعوة الإسلامية** : نامیلكەیەكی بچوكە.

١٣- **مستقبل الحركة الإسلامية في الهند** : بریتیە لە وتارێك كە لە (كۆنگرەی كۆمەڵی ئیسلامی) دا لە ساڵی (١٩٤٧) پێشكەشی كردووە، لەپێش ئەوەی هیندستان و پاكستان دابەشبن بۆ دوو وڵاتی سەربەخۆ.

١٤- **الدعوة الإسلامية ومنهجها** : بریتیە لە وتارێك كە لە (كۆنگرەی كۆمەڵی ئیسلامی) دا لە ساڵی (١٩٤٥) دا پێشكەشی كردووە.

١٥- **منهج الحركة الإسلامية للمستقبل** : بریتیە لە وتارێكی دوورودرێژ كە لە (كۆنگرەی گشتی كۆمەڵی ئیسلامی) دا لە ساڵی (١٩٥٦) دا پێشكەشی كردووە.

١٦- **الجماعة الإسلامية خلال (٢٩) عاما** : بریتیە لە وتارێك كە بەهۆی دامەزراندنی (كۆمەڵی ئیسلامی) یەوە لە ساڵی (١٩٧٠) پێشكەشی كردووە.

١٧- **تذكرة دعاة الإسلام** : وەرگیراوە لەو نووسینانەی كە باس لە بانگەوازی ئیسلامی و پێویستیەكانی دەكات، لەلایەن مامۆستا (خلیل الحامدی) یەوە كۆكراونەتەوە و پاشان وەریگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی و، دواتر لەگەڵ كتێبی (الصفات اللازمة للعاملين في مجال الدعوة الإسلامية) بەچاپی گەیاندووە.

١٨- **العلم والعمل** : وەرگیراوە لەو نووسینانەی كە باس لە بانگەوازی ئیسلامی و پێویستیەكانی دەكات، لەلایەن مامۆستا (عاصم النعمانی) یەوە كۆكراونەتەوە و پاشان وەریگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی و بە چاپی گەیاندووە.

**١٩- هلموا نقوم بتغيير هذا العالم** : بريتيە لە ناميلكەيەكی بچوك، وەرگيراوە لەو نووسينانەی كە باس لە بانگەوازی ئيسلامی و پێويستيەكانی دەكات، لەلايەن مامۆستا (كوكب الصديقی) يەوە كۆكراونەتەوە و وەريگێڕاوە بۆسەر زمانی ئينگليزی و دواتر بەچاپی گەياندووە.

**٢٠- الحركة الإسلامية – دعوتها و تأريخها** : وەرگيراوە لەو نووسينانەی كە باس لە بانگەوازی ئيسلامی و پێويستيەكانی دەكات، لەلايەن پرۆفيسۆر (خورشيد أحمد) ەوە كۆكراونەتەوە و پاشان وەريگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی و بە چاپی گەياندووە.

**٢١- تقرير عن الجماعة الإسلامية** : پێكهاتووە لە شەش بەرگ، باس لە هەموو چالاكيەكانی (كۆمەڵی ئيسلامی) دەكات هەر لە ساڵی دامەزراندنيەوە (١٩٤١) تا ساڵی (١٩٥١) .

**پێنجەم: ئەو کتێبانەی کەلە بابەتی (جیهاد و تێکۆشانی ئیسلامی) دا نووسیونی :**

١- **الجهاد في الإسلام** : (هۆکاری نووسینی ئەم کتێبە دەگەڕێتەوە بۆ قسەکەی (مەهاتما غاندی) کە وتبووی: ئیسلام بە زەبری شمشێر بڵاوبۆتەوە. جا بەو بۆنەوە ئیمام (محمد عەلی جەوهەری) سەرۆکی (بزووتنەوەی خیلافە لە هیند) لە مزگەوتی گەورەی (دەلهی) وتارێکی گرنگی لەو بارەوە داو وەڵامی ئەو جۆرە پڕوپاگەندانەی دایەوە و، وتبووی: بریایە کەسێ لە موسوڵمانان هەستایە بە پەرچدانەوەی قسەی هندۆسەکان کە دەرهەق بە ئیسلام و موسوڵمانان دەیکەن. جا مەودودی پێی خۆش بوو کە ئەو موسوڵمانە خۆی بێ، هەر بۆیە دەستی کرد بە لێکۆڵینەوەیەکی زۆر ورد و هەرچی کتێبێ کە لەو بارەیەوە نووسرابوو کۆی کردنەوە و خوێندیەوە و، پاشان دەستی کرد بە نووسین لەو بارەیەوە و لە ڕۆژنامەی (جمعیة) کە زمان حاڵی (جمعیة العلماء) بوو بە چەند ژمارەیەکی یەك لە دوای یەك بڵاوی کردەوە، پاشان لە ساڵی (١٩٢٧) لە دوو توێی کتێبێکدا بە چاپی گەیاند، وە وتراوە: کە ئەمە یەکەم کتێبی پێشەوا مەودودیە کە نووسیبێتی و بڵاوکرابێتەوە، دکتۆر (محمد إقبال) یش لەبەر گرنگی ئەم کتێبە بەردەوام ئامۆژگاری گەنجانی موسوڵمانانی دەکرد کە ئەو کتێبە بخوێننەوە و سوودی لێ وەربگرن، شایانی باسە ئەم کتێبە وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبی تەنها دوو بابی کۆتایی نەبێت.



**مەهاتما غاندی**

٢- **الجهاد في سبيل الله** : بريتيه له وتارێك كه داويەتی، ساڵی (١٩٣٩) بەچاپ گەيەنراوە، وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبی.

**شەشەم: ئەو كتێبانەی كەلە بابەتی (حكومەتی ئیسلامی و حوكمڕانی) دا نووسیونی:**

١- **كيف تقام الحكومة الإسلامية** : بريتيه له وتارێك كه له زانكۆی (علی كره الإسلامية) له ساڵی (١٩٣٩) پێشكەشی كردووه، دواتر لەلايەن (دار العروبة للدعوة الإسلامية) كه سەر به (كۆمەڵی ئیسلامی له پاكستان) ە وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبی و له ساڵی (١٩٤٦) به ناوی (منهاج الإنقلاب الإسلامي) به چاپ گەيەنراوە.

٢- **نظرية الإسلام السياسية** : بريتيه له وتارێك كه له شاری (لاهور) دا پێشكەشی كردووه له ساڵی (١٩٣٩) ، دواتر لەلايەن (دار العروبة للدعوة الإسلامية) يەوە وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبی و له ساڵی (١٩٤٦) به چاپ گەيەنراوە.

٣- **استفتاء ذو بال** : بريتيه له ناميلكەيەكی زۆر گرنگ، له ساڵی (١٩٤٠) نووسيويەتی.

٤- **الشريعة الإسلامية وطرق تنفيذها في باكستان** : بريتيه له وتارێك كه له (كلية الحقوق) له شاری (لاهور) له ساڵی (١٩٤٨) دا پێشكەشی كردووه، دواتر لەلايەن مامۆستا (عاصم الحداد) ەوە وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبی بەناوی (القانون الإسلامي وطرق تنفيذه في باكستان) .

٥- **أسس الدستور الإسلامي في القرآن** : ساڵی (١٩٥٢) نووسيويەتی، بريتيه له بەرپەرچدانەوەی قسەكەی پارێزەری بەناوبانگ (بروهی) كه وتبووی: قورئان بنەماكانی دەستوری ئیسلامی تێدا نيه.

٦- **تدوين الدستور الإسلامي** : بريتيه له وتارێك كه ساڵی (١٩٥٢) له بەرپەرچدانەوەی قسەكەی پارێزەری بەناوبانگ (بروهی) داويەتی، دواتر لەلايەن

مامۆستا (عاصم الحداد) ەوە وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبی و ساڵ (١٩٥٣) بە چاپی گەیاندووە.

٧- **عقوبة المرتد في الشريعة الإسلامية** : ساڵی (١٩٤٣) نووسیویەتی.

٨- **حقوق أهل الذمة في الدولة الإسلامية** : ساڵی (١٩٤٨) نووسیویەتی، وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبی.

٩- **المقترحات الدستورية** : بریتیە لەو (پێشنیارە دەستورییانەی) کە پێشکەشی کردووە بۆ دانانی دەستورێکی ئیسلامی بۆ پاکستان لە ساڵی (١٩٥٢) دا.

١٠- **حقوق الإنسان الأساسية** : بریتیە لە وتارێك کە لە شاری (لاهور) پێشکەشی کردووە لەساڵی (١٩٦٣) دا.

١١- **حول تطبيق الشريعة الإسلامية في باكستان** : بریتیە لە گفتوگۆیەکی نێوان مەودودی و نوێنەری ئیزاعەی جمهوری پاکستانی ئیسلامی سەبارەت بە تەتبیقی شەریعەتی ئیسلامی لە پاکستاندا، ساڵی (١٩٧٨) وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبی.

١٢- **نظام الحياة في الإسلام** : بریتیە لە کۆمەڵە وتارێك کە لە ئیزاعەی پاکستانەوە ساڵی (١٩٤٨) پێشکەشی کردوون، دواتر لەلایەن (مؤسسة الرسالة) وە وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبی.

١٣- **الخلافة والملك** : بریتیە لە باسی جیاوازییەکانی نێوان خیلافەتی ڕاشیدە و مەلیکەکان، لە ساڵی (١٩٦٦) بۆ یەکەمجار بە زمانی (ئوردی) بەچاپ گەیەنرا و، دواتر لەلایەن مامۆستا (أحمد إدريس) ەوە وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبی و لە (قاهیرە) ساڵی (١٩٧٨) بەچاپ گەیەنراوە.

١٤- **الإسلام والديمقراطية العلمانية** : بریتیە لە وتارێك کە لە (کۆنگرەی کۆمەڵی ئیسلامی) لە ساڵی (١٩٤٧) دا پێشکەشی کردووە.

١٥- **المطالبة بإقامة النظام الإسلامي** : بريتيە لە وتارێك كە لە كاتی تێكۆشانی بۆ (هێنانەدی یاسایەكی ئیسلامی) لە ساڵی (١٩٤٨) دا وتوویەتی.

١٦- **نظام الحياة للإسلام ومبادئه الأساسية** : بريتيە لە كۆمەڵە وتارێك كە كاتی خۆی لە شوێنە جیاجیاكاندا لەو بارەوە پێشكەشی كردووە.

١٧- **الدولة الإسلامية** : بريتيە لە كۆمەڵە نووسینێك كە لە (حكومەتی ئیسلامی) یەوە لە سەرەتای بانگەوازەوە هەتا ساڵی (١٩٦٢) نووسیونی، دواتر پرۆفیسۆر (خورشيد أحمد) [1] هەستاوە بە كۆكردنەوە و وەرگێرانیشی بۆسەر زمانی عەرەبی و بە چاپ گەیاندنی.



**پرۆفیسۆرخورشید أحمد**

---

(١) ناوی تەواوی: پرۆفیسۆر (خورشید ئەحمەد) ی كوڕی (محمد نذیر) ی قورەیشی یە، یەكێك بووە لە قوتابیەكانی پێشەوا (مەودودی) و، دواتر دەچێتە ڕیزی ڕێكخستنەكانی (جمعية الطلبة الإسلامية بباكستان) ەوە و، دواتر لە ساڵی (١٩٥٣) دا هەڵدەبژێرێ بە سەرۆكی (جمعية الطلبة الإسلامية) و، وە لە ساڵی (١٩٥٥) دا ماجستێر بەدەست دەهێنێ لە لە زانكۆی (كراتشی) لە بواری (ئابووری) دا، پاشان دەچێتە ڕیزەكانی (كۆمەڵی ئیسلامی) یەوە و دەبێتە ئەندامی شورای جەماعەكە و، هەروەها ئەمینداری گشتی (مجمع المعارف الإسلامية) ی سەر بە (كۆمەڵی ئیسلامی) لە ساڵی (١٩٦٨)، پاشان وازی لە كاری زانكۆ هێناو هەستا بە دامەزراندنی (المؤسسة الإسلامية بإنجلترا) و، پاشان لە ساڵی (١٩٧٨) دا بووە وەزیری (پلاندانان) لە حكومەتەكەی جەنڕاڵ (ضياء الحق) دا و، دواتر ئیستیقالەی كرد بەهۆی كشانەوەی (كۆمەڵی ئیسلامی) لە حكومەتەكەی جەنڕاڵ.

١٨- **حقوق الإنسان الأساسية في الإسلام** : بريتيە لە كۆمەڵە نووسينێك كە لە باسى (مافى مرۆڤ لە ئيسلام) دا نووسيونى، دواتـر لەلايـەن (إيـم إيـم شـريف) ەوە كۆكراونەتەوە و وەريگێڕاونەتە سەر زمانى ئينگليزى و بەچاپى گەياندوون.

١٩- **مفاهيم إسلامية حول الدين والدولة** : لەلايەن مامۆستا (خليل الحامـدى) يەوە وەرگێڕدراوەتە سەر زمانى عەرەبى و بەچاپ گەيەنراون.

٢٠- **نظريـة الإسـلام وهديـة في السياسـة والقـانون والدسـتور** : بريتيـە لـە كۆمەڵە نووسينێك كە لەو بارەيەوە نووسيونى، دواتر لەلايـەن (عاصـم الحـداد) ەوە لە ساڵى (١٩٦٠) دا كۆكراونەتەوە و وەريگێڕاوەتە سەر زمانى عەرەبى.

**حەوتەم: ئەو كتێبانەی كەلە بابەتی (ئابووری و بژێوی) دا نووسیونی :**

١- **معضلات الإنسان الاقتصادية وحلها في الإسلام** : بريتيە لە وتارێك كـە لـە زانكۆى (على كره الإسلامية) لە ساڵى (١٩٤١) پێشكەشـى كـردووە، دواتـر لەلايـەن مامۆستا (مسعود الندوى) يەوە وەرگێڕدراوەتە سەر زمانى عـەرەبى و لەلايـەن (دار العروبة للـدعوة الإسـلامية) كـە سـەر بـە (كۆمـەڵى ئيسـلامى پاكسـتان) ە بـە چـاپ گەيەنراوە.

٢- **أسـس الاقتصـاد بـين الإسـلام والـنظم المعاصـرة** : سـاڵى (١٩٣٧) نووسيويەتى، دواتر لەلايەن (عاصم الحداد) ەوە وەرگێڕدراوەتە سەر زمانى عەرەبى و لەلايەن (دار السعودية للنشر) ەوە بەچاپ گەيەنراوە.

٣- **الربـا**: سـاڵى (١٩٣٧) نووسـيويەتى، دواتـر لەلايـەن (عاصـم الحـداد) ەوە وەرگێڕدراوەتە سەر زمانى عـەرەبى و لەلايـەن (مؤسسـة الرسـالة) لـە (بـەيروت) و، (دار الأنصار) ەوە بەچاپ گەيەنراوە.

٤- **مسـألة ملكيـة الأرض في الإسـلام** : سـاڵى (١٩٣٤) نووسـيويەتى، بـەڵام بـۆ يەكـەمجار لـە سـاڵى (١٩٥٠) بڵاوكرايـەوە و، دواتـر لەلايـەن (خليـل الحامـدى) يـەوە

وەرگێڕدراوەتـە سـەر زمـانی عـەرەبی و لەلایـەن (دار القلـم) ی (کوەیـت) یـەوە بەچـاپ گەیەنراوە.

٥- **مبادیء الإقتصاد في القرآن** : ساڵی (١٩٦٩) نووسیویەتی.

٦- **مبادیء أساسیة للإقتصاد الإسلامي** : بریتیە لـە وتارێك کـە لـە زانکـۆی (بنجاب) لە ساڵی (١٩٦٥) دا پێشکەشی کردووە.

٧- **الراسمالیة والشیوعیة** : ساڵی (١٩٥٣) بەچاپ گەیەنراوە و بڵاوبۆتەوە.

٨- **الإسلام والعدالة الإجتماعیة** : بریتیە لە وتارێك کە لە (کۆنگرەی ئیسلامی لە مەککەی پیرۆز) لە ساڵی (١٩٦٢) دا پێشکەشی کردووە، دواتـر لەلایـەن (مکتبـة دار البیـان) ی (کوەیـت) یـەوە وەرگێڕدراوەتـە سـەر زمـانی عـەرەبی و بـە چـاپ گەیەنراوە.

٩- **نظام الإقتصاد الإسلامي** : بریتیە لە کۆمەڵە نووسینێکی هەڵبژێرراو کە لە بواری (ئابووری ئیسلام) دا نوسیونی، دواتـر لەلایـەن پرۆفیسـۆر (خورشـید أحمـد) ەوە کۆکراونەتـەوە و وەریگێڕاوەتـە سـەر زمـانی عـەرەبی و لـە سـاڵی (١٩٦٩) بـە چاپی گەیاندووە.

**هەشتەم: ئەو کتێبانەی کەلە بابەتی (ئەخلاق و تەزکیە) دا نووسیونی :**

١- **نظریة الإسـلام الأخلاقیـة** : سـاڵی (١٩٤٤) نووسـیویەتی، دواتـر لـە ساڵی (١٩٥٥) بەچاپ گەیەنراوە.

٢- **الصلاح والفساد** : بریتیـە لـە وتارێـك کـە لـە (کـۆنگرەی گشـتی کۆمـەڵی ئیسلامی) لە ساڵی (١٩٤٧) دا پێشکەشی کردووە، دواتر لەلایەن (خلیـل الحامـدی) یەوە وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبی و لە ساڵی (١٩٧٦) دا بەچاپی گەیاندووە.

٣- **الإسلام والعنایة بتزکیة النفس** : کتێبێکـی گرنگـە و لـەژێر سەرپەرشـتی (کۆمەڵی ئیسلامی لە هیندستان) ساڵی (١٩٦٧) بەچاپ گەیەنراوە.

**نۆیەم: ئەو کتێبانەی کەلە بابەتی (ژیانی کۆمەڵایەتی) دا نووسیونی :**

١- **الحجاب** : ساڵی (١٩٣٩) نووسیویەتی، ساڵی (١٩٥٦) وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبی.

٢- **حقوق الزوجين - دراسة نقدية لقانون الأحوال الشخصية** : ساڵی (١٩٣٥) نووسیویەتی، دواتر لەلایەن مامۆستا (أحمد إدريس) ەوە وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبی و، ساڵی (١٩٧٩) لەلایەن (المختار الإسلامي) لە (قاهیرە) بەچاپ گەیەنراوە.

٣- **حركة تحديد النسل في الميزان** : ساڵی (١٩٣٥) نووسیویەتی، دواتر لەلایەن (مؤسسة الرسالة) ەوە وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبی و بەچاپ گەیەنراوە.

٤- **الإسلام وتنظيم الأسرة** : بریتیە لە کتێبێکی بچوك و، ساڵی (١٩٦٠) نووسیویەتی.

٥- **مسألة اللباس** : بریتیە لە باسێکی زۆر نایاب لە بارەی پۆشاکەوە، ساڵی (١٩٢٩) نووسیویەتی، دواتر لەلایەن مامۆستا (خليل الحامدی) یەوە وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبی و لە ساڵی (١٩٧٦) بەچاپی گەیاندووە.

٦- **مسألة تعدد الزوجات** : ساڵی (١٩٦٣) نووسیویەتی.

**دەیەم: ئەو کتێبانەی کەلە بابەتی (فێرکاری و ڕۆشنبیری) دا نووسیونی :**

١- **منهج جديد للتعليم والتربية** : بریتیە لە وتارێك کە لە (دار العلوم لندوة العلماء بلكهنو) لە ساڵی (١٩٤٠) دا پێشکەشی کردووە، دواتر بەچاپ گەیەنراوە.

٢- **المنهج الإسلامي للتعليم وطرق تنفيذه في باكستان** : بریتیە لە وتارێك کە لە کۆنگرەی گشتی (جمعية الطلبة الإسلامى) لە ساڵی (١٩٥٢) دا پێشکەشی

کردووه، دواتر بەشێوەی نامیلەکەیەك بەچاپ گەیەنراوه.

٣- **منهج التعليم الإسلامي** : سالّی (١٩٦٣) نووسیویەتی، کە بریتیە لە وەڵامی پرسیارێکی (اللجنة التعليمية) .

٤- **خطبة توزيع الشهادات** : بریتیە لە وتارێك کە لە ئاهەنگی دەرچوونی یەکێ لە (کوللیه ئیسلامی) یەکاندا لە سالّی (١٩٤٠) دا پێشکەشی کردووه، دواتر بەشێوەی نامیلەکەیەك بەچاپ گەیەنراوه.

٥- **التعليمات** : سالّی (١٩٦٣) نووسیویەتی.

**پانزەیەم: ئەو کتێبانەی کەلە بابەتی (ڕێگری لە بەرەنگاربوونەوەی دوژمنانی ئیسلام) دا نووسیونی :**

١- **نحن والحضارة الغربية** : سالّی (١٩٣٢) بۆ (١٩٣٨) لە گۆڤاری (ترجمان القرآن) نووسیویەتی و، دواتر لە دوو توێی کتێبێکدا کۆی کردنەوه و ناوی لێنا (التنقيحات) بە زمانی (ئوردی) ، پاشان کە وەرگێڕایە سەر زمانی عەرەبی ناوی لێنرا (نحن والحضارة الغربية) .

٢- **الإسلام والمدنية الحديثة** : سالّی (١٩٤٧) نووسیویەتی، دواتر لەلایەن (خليل الحامدی) یەوه وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبی و لەلایەن (دار السعودية للنشر) لە (جدده) و، (دار الأنصار) لە (قاهیره) بەچاپ گەیەنراوه.

٣- **الإسلام اليوم** : بریتیە لە وتارێك کە لە سالّی (١٩٦٣) پێشکەشی کردووه، دواتر لەلایەن مامۆستا (خليل الحامدی) یەوه وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبی و، لەلایەن (دار العروبة للدعوة الإسلامية) لە شاری (لاهور) بەچاپ گەیەنراوه.

٤- **المحاضرات في أوروبا** : بریتیە لەو وتارانەی کە لە ئەمریکا و ئەوروپا لە موناسەبە جیاوازەکاندا پێشکەشی کردوون، سالّی (١٩٨١) لەلایەن ئیدارەی گۆڤاری (ترجمان القرآن) ەوه لە شاری (لاهور) بەچاپ گەیەنراوه.

٥- **الإسلام في مواجهة التحديات المعاصرة** : بریتیـە لـە هەڵبـژاردەی کۆمەڵـە نووسینێکی مەودودی کە لەو بارەیەوە نووسیونی، دواتـر لەلایـەن مامۆسـتا (خلیـل الحامدی) یەوە کۆکراونەتەوە و وەرگێڕدراوەتـە سـەر زمـانی عـەرەبی و پاشـان بـە چاپی گەیاندووە.

**دوانزەیەم: ئەو کتێبانەی کەلە بابەتی (لاوان و گەنجان) دا نووسیونی :**

١- **واجب الشباب المسلم اليوم** : بریتیە لە وتارێك کـە لـە ساڵی (١٩٦٢) لـە مـەوسمی حەجـدا بـۆ کۆمەڵـە گـەنجێکی موسـوڵمان لـە مزگـەوتی (دەهلـەوی) لـە (مەککەی پیرۆز) دا پێشکەشی کردووە، دواتر لەلایەن (المكتب الإسلامي) یـەوە لـە (بەیروت) وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبی و، بەچاپ گەیەنراوە.

٢- **تحديات العصر الجديد والشباب** : بریتیە لە وتارێك کە لە سـاڵی (١٩٧٥) لـە کـۆنگرەی سـاڵانەی (جمعيـة الطلبـة الإسـلامية) دا پێشکەشـی کـردووە، دواتـر لەلایەن مامۆسـتا (خلیـل الحامـدی) یـەوە وەرگێڕدراوەتـە سـەر زمـانی عـەرەبی و، لەلایەن (دار العروبة للدعوة الإسلامية) لە شاری (لاهور) بەچاپ گەیەنراوە.

٣- **دور الطلبة المسلمين في بناء مستقبل العالم الإسلامي** : بریتیە لە وتارێك کە لە ساڵی (١٩٦٦) لە کۆنگرەی ساڵانەی (جمعية الطلبة الإسلامية) دا پێشکەشـی کردووە، دواتر لەلایەن مامۆستا (خلیل الحامدی) یەوە وەرگێڕدراوەتـە سـەر زمـانی عـەرەبی و، لەلایـەن (الإتحـاد الإسـلامي العـالمي للمنظمـات الإسـلامية) لـە وڵاتـی (کوەیت) بەچاپ گەیەنراوە.

٤- **دور الطلبة في بناء مستقبل دولة باكستان الإسلامية** : بریتیـە لـە وتارێك کە لە ساڵی (١٩٦٥) لە کۆنگرەی ساڵانەی (جمعية الطلبة الإسـلامية) دا پێشکەشـی کردووە، دواتر بەچاپ گەیەنراوە.

٥- **التصريحات** : کۆمەڵە پرسیارێکی خوێندکارانی (جمعية الطلبـة الإسـلامية)

کەلە کۆنگرەی خوێندکاران و موناسەبە جیاجیاکاندا لە (پێشەوا مەودودی) یان کردووە و دواتریش هەر لەلایەن خۆیانەوە کۆکراوەتەوە و بەچاپ گەیەنراوە.

٦- **بين يدي الشباب** : هەڵبژاردەی کۆمەڵە تەوجیهاتێکی (پێشەوا مەودودی) یە بۆ خوێندکاران کە مامۆستا (خليل الحامدی) هەستاوە بە کۆکردنەوە و وەرگێڕانی بۆ عەرەبی و دواتر بەچاپی گەیاندووە.

**سیانزەیەم: ئەو کتێبانەی کەلە بابەتی (مەسەلەکانی جیهانی ئیسلامی) دا نووسیونی :**

١- **مسألة الخلافة** : نامیلکەیەکە ساڵی (١٩٢٢) نووسیویەتی، ئەو کاتەی کەلە ڕیزی (حركة المحافظة على الخلافة الإسلامية) دا ئەندام بوو.

٢- **مجازر اليونانيين في سمرنا** : هەر لەو ساڵانەی (١٩٢٢) بۆ (١٩٢٤) دا نووسیویەتی.

٣- **النشاطات التبشيرية في تركيا** : بە هەمان شێوە هەر لەو ساڵانەی (١٩٢٢) بۆ (١٩٢٤) دا نووسیویەتی.

٤- **قضايانا الداخلية والخارجية** : بریتیە لە وتارێك کە لەساڵی (١٩٥١) لە کۆنگرەی ساڵانەی (الجماعة الإسلامية) دا پێشکەشی کردووە، دواتر بەچاپ گەیەنراوە.

٥- **بين الدعوة القومية والرابطة الإسلامية** : بریتیە لە نووسینێکی ڕەخنە ئامێز کە ساڵی (١٩٣٩) نوسیویەتی و، ئاراستەی قەومیەی هیندی کردووە کە حیزبی (کۆنگرەی نیشتیمانی هیندی) ئاڵا هەڵگری بووە، دواتر لەلایەن مامۆستا (خليل الحامدی) یەوە وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبی و، لەلایەن (دار العربية للطباعة والنشر) لە (بەیروت) ساڵی (١٩٦٧) بەچاپ گەیەنراوە.

٦- **أضواء على حركة التضامن الإسلامي** : بریتیە لە وتارێك کە لەساڵی (١٩٦٥) لە (کۆنگرەی ئیسلامی) لە (لاهور) دا پێشکەشی کردووە، دواتر لەلایەن

مامۆستا (خلیل الحامدی) یەوە وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبی و، ساڵی (١٩٦٧) لەلایەن (الدار السعودیة للنشر) بەچاپ گەیەنراوە.

٧- **مأساة الشرق الأوسط** : باسێکە لە ساڵی (١٩٦٧) نووسیویەتی لەبارەی داگیرکردن و لەدەستدانی (بیت المقدس) ەوە لەلایەن جوولەکەوە، دواتر لەلایەن مامۆستا (خلیل الحامدی) یەوە وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبی و، لەگەڵ کتێبی (طائفة من قضایا الأمة الإسلامیة) بەچاپی گەیاندووە.

٨- **فاجعة المسجد الأقصی** : بریتییە لە وتارێك کە ساڵی (١٩٦٩) لە کۆبوونەوەیەکی (کۆمەڵی ئیسلامی) لە (لاهور) کە سازیاندابوو بەبۆنەی سووتاندن و گڕگرتنی (مزگەوتی ئەقصا) وە پێشکەشی کردووە، دواتر لەلایەن مامۆستا (خلیل الحامدی) یەوە وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبی و، بەچاپ گەیەنراوە.

٩- **قضیة کشمیر المسلمة** : باسێکە لە ساڵی (١٩٦٥) نووسیویەتی لەبارەی هەڵگیرساندنی جەنگ لە نێوان (هندستان) و (پاکستان) دا ، دواتر لەلایەن مامۆستا (خلیل الحامدی) یەوە لە هەمان ساڵدا وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبی و، لەلایەن (دار العروبة للدعوة الإسلامیة بلاهور) بەچاپ گەیەنراوە.

١٠- **نحن وبنغلادیش** : باسێکە لە ساڵی (١٩٧٢) نووسیویەتی لەبارەی لەدەستدانی (پاکستانی شەرقی) ، کە لە ساڵی (١٩٧١) دا دەوڵەتی (بەنغلادی) شی تێدا دامەزرا، دواتر لەلایەن مامۆستا (خلیل الحامدی) یەوە وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبی و، بەچاپ گەیەنراوە.

١١- **عرض الموجز للوضع الذي تعیش فیه الأقلیة الإسلامیة في الهند** : نامیلکەیەکە کاتی خۆی مەقالەیەك بووە کە نووسیویەتی بۆ یەکەم (کۆنگرەی قیممەی ئیسلامی) لە (رباط) و لەوێ پێشکەشی کردووە، دواتر لەلایەن مامۆستا

(خليل الحامدي) یەوە وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبی و، بەچاپ گەیەنراوە.

١٢- **قضايا إسلامية الهامة تنتظر الحلول** : بريتيە لە (مذكرة) یەك كە ساڵی (١٩٧٤) لە (كۆنگرەی قیمەی ئیسلامی) لە (لاهور) پێشكەشی كردووە، دواتر وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبی و، بەچاپ گەیەنراوە.

١٣- **طائفة من قضايا الأمة الإسلامية في القرن الحاضر**: بريتيە لە هەڵبژاردەی ئەو نووسینانەی كەلە مەسەلەكانی (ئوممەی ئیسلامی) دا لە موناسەبە جۆراوجۆرەكاندا نووسیویەتی، دواتر لەلایەن مامۆستا (خليل الحامدي) یەوە وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبی و، لەلایەن (دار العروبة للدعوة الإسلامية بالمنصورة ، لاهور) ساڵی (١٩٨١) بەچاپ گەیەنراوە.

**چواردەیەم: ئەو كتێبانەی كەلە بابەتی (حیزب و گروهەكانی دژ بە ئیسلام و ڕوخێنەرەكانی) دا نووسیونی:**

١- **المسألة القاديانية** : ساڵی (١٩٥٣) نووسیویەتی، لەم كتێبەدا تیشك خراوەتە سەر بیروباوەڕ و نەخشە و بەرنامەكانی فیرقەی قادیانی. شایانی وتنە: وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبی بەناوی **"ما هي القاديانية"**.

٢- **ختم النبوة** : تەفسیری ئایەتی (ما كان محمد أبا أحد من رجالكم ...) وە، دواتر لەلایەن مامۆستا (خليل الحامدي) یەوە وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبی و، لەلایەن (دار العروبة للدعوة الإسلامية بالمنصورة ، لاهور) بەچاپ گەیەنراوە.

٣- **البيانات** : بريتيە لە سێ بڵاوكراوەی مەودودی لەو كاتەی كە دادگایی دەكرا لەلایەن حكومەتەوە بەهۆی ئەو شۆڕشەی كە موسوڵمانەكان دژ بە (قادیانییەكان) ساڵی (١٩٥٣) بەرپایان كردبوو.

٤- **التعليق على تقرير القاضي (محمد منير) حول الإضطرابات عام**

(١٩٥٣) : بریتیە لە نوسینێك كە تێیدا ڕەخنە لە قازی (محمد منیر) دەگرێ لەسەر ئەو تەعلیقانەی كە گرتوویەتی لە خۆپیشاندانەكانی موسوڵمانان لە ساڵی (١٩٥٣) دا، دواتر بەچاپ گەیەنراوە.

٥- **مكانة السنة في تشريع** : نووسینێكە لە دژی ڕەخنەكانی (منكري السنة) نووسیویەتی.

٦- **إثبات الذبح بآيات الذبح** : نووسینێكە ساڵی (١٩٣٢) لە وەڵامی ڕەخنەكانی (منكري السنة) نووسیویەتی لەبارەی قوربانیەوە.

٧- **الذبح – في محكمة العقل والشريعة** : نووسینێكی ڕەخنە ئامێزە ساڵی (١٩٥٠) لە بەرامبەر هەڵوێست و بۆچوونەكانی (منكري السنة) لەبارەی قوربانیەوە نووسیویەتی.

٨- **بين المودودي والبابا** : نامیلكەیەكە باس لە (الأنشطة التبشيرية في العالم الإسلامي) دەكات، كە وەڵامێكە بۆ (بابای ڤاتیكان) ، دواتر لەلایەن مامۆستا (خليل الحامدی) یەوە وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبی و، بەچاپ گەیەنراوە.

٩- **مسألة القومية** : كتێبێكی زۆر گرنگە لە ساڵی (١٩٣٩) دا نووسیویەتی، كە ڕەخنەیە بۆسەر (حركة القومية الوطنية الجاهلية) یە، كە زۆرێك لە ڕۆشنبیرانی وڵات پێی موعجەب بوون، دواتر وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبی و، بەچاپ گەیەنراوە.

١٠- **شؤون باكستان الداخلية والخارجية.**

**پانزەیەم: ئەو كتێبانەی كەلە بابەتی (مەسەلەكانی ناوخۆی وڵات) دا نووسیونی :**

١- **حركة تحرير الهند والمسلمون** : كتێبێكی زۆر گرنگە لە ساڵی (١٩٣٧) دا نووسیویەتی.

٢- **النشاط الإنتخابي** : ساڵی (١٩٥١) دا نووسیویەتی.

٣- **الإنتخابات المختلطة .. لماذا لا ؟** : ساڵی (١٩٥٦) دا نووسیویەتی.

٤- **الحركة لإعادة الديمقراطية** : نامیلکەیە ، ساڵی (١٩٦٨) دا نووسیویەتی.

٥- **مقتضيات الحرية والإسلام** : نامیلکەیە ، ساڵی (١٩٤٨) دا نووسیویەتی.

٦- **التعليق على التوصيات الدستورية** : نامیلکەیە ، ساڵی (١٩٥٠) دا نووسیویەتی.

٧- **تحليل الأوضاع باكستان الشرقية** : بریتیە لە ڕاپۆرتێك کە ساڵی (١٩٥٥) دا نووسیویەتی لەو کاتەی کە سەردانی (پاکستانی شەرقی) کردووە.

**شانزەیەم: ئەو کتێبانەی کەلە بابەتی (مەوسوعاتی ئیسلامی) دا نووسیونی :**

١- **التفهيمات - ثلاث مجلدات**: بریتیە لەو نووسینانەی کە لەسەرەتای بانگەوازیەوە هەتا کۆچی دوایی نووسیویەتی لەبارەی (هەڵوێستی ئیسلام) لەمەڕ (شارستانی ڕۆژئاواوە) کە هێناویەتی بۆناو موسوڵمانان.

٢- **الرسائل والمسائل - خمسة مجلدات** : کۆمەڵە وەڵامێکی پێشەوا مەودودیە بۆ پرسیارە جۆراوجۆرەکان لەبابەتە جیاوازەکاندا.

٣- **المقابلات الصحفية** : بریتیە لە چاوپێکەوتنە ڕۆژنامەوانیەکان کە لەگەڵیدا کراوە، لەلایەن (أبوطارق) ەوە کۆکراونەتەوە و بەچاپ گەیەنراون.

٤- **المحاضرات - مجلدين** : بریتیە لە لێدوان و وتارە جۆراوجۆرەکانی کە داویەتی لە موناسەبە جیاجیاکاندا، لەلایەن (ثروت صولت) ەوە کۆکراونەتەوە و بەچاپ گەیەنراون.

٥- **الرسائل** : جیایە لە کتێبی (الرسائل والمسائل) ، تا ئێستا دوو بەرگی لێ دەرچووە، لەلایەن سکرتێرەکەی (عاصم النعمانی) یەوە کۆکراونەتەوە و بەچاپ گەیەنراون.

٦- **رسائل من الزنزانة** : بریتیە لەو نامانەی کەلە زینداندا نووسیونی، لەلایەن شێخ (محمد شریف) ەوە کۆکراونەتەوە و بەچاپ گەیەنراون.

٧- **الخطب الإذاعية** : بریتیە لەو وتارانەی کە لە ئیزاعەوە وتویەتی، دواتر کۆکراونەتەوە و بەچاپ گەیەنراون.

٨- **في جلسات الأستاذ المودودي العصرية** : بریتیە لەو وتارانەی کە لەدوای نوێژی عەصرەوە لە کتێبخانەی (کۆمەڵی ئیسلامی) دا وتویەتی، دواتر لەلایەن دکتۆر (رفیع الدین الهاشمي) و مامۆستا (مظفر بك) ەوە کۆکراونەتەوە و بەچاپ گەیەنراون، تا ئێستا دوو بەرگی لێ دەرچووە.

**حەڤدەیەم: ئەو کتێبانەی کەلە بابەتی (چەند باسێکی جیاواز) دا نووسیونی :**

١- **كسوة الكعبة المشرفة – تأريخها وحكمها الشرعي** : باسێکە تایبەتە لەو بارەوە و ساڵی (١٩٦٣) نووسیویەتی.

٢- **الشخصيات الإسلامية المعاصرة** : لە بارەی (کەسایەتیە ئیسلامیە موعاصیرەکانەوە) لە بۆنە جیاجیاکاندا نووسویەتی، ساڵی (١٩٨٧) لە شاری (لاهور) بەچاپ گەیەنراوە.

٣- **المراسلة بين الأستاذ المودودي والسيدة مريم جميلة** : بریتیە لەو نامانەی کەلە نێوان پێشەوا مەودودی و کیژی تازە موسوڵمانی ئەمریکی (مریم جمیلة) [1] دا ئاڵوگۆڕکراوە، بە مەبەستی زیاتر شارەزابوون لە ئیسلام و تێگەیشتن لە بنەماکانی.

---

(١) ناوی (مارجریت مارکوس) ە، لە ساڵی (١٩٣٤) ی زایین لە شاری (نیویورك) ی ئەمریکا لە بنەماڵەیەکی (جوولەکە) بە بنەچە (ئەڵمانی) لە دایك بووە، دەگێڕنەوە کە پێش ئەوەی موسوڵمانیش ببێ: قەت مەشرووبی نەخواردۆتەوە، وە پەیوەندی لەگەڵ پیاواندا نەبەستووە، وە ئامادەی ئاهەنگەکانیشیان نەبووە..



مەریەم جەمیلە

٤- **مبادئ الإسلام الإقتصادية والسياسية** بریتیە لەو نووسنانەی کە لە بارەی (ئابووری و سیاسەت) لە (بۆنە جیاجیاکان) دا نووسیویەتی، دواتر لەلایەن (إیم. إیم. شریف) ەوە کۆکراونەتەوە و کراوە بە ئینگلیزی و بەچاپ گەیەنراون.

٥- **الإمامان الجليلان أبوحنيفة وأبويوسف** بریتیە لە بارەی ئەو دوو ئیمامە بەڕێزەوە نووسیویەتی، دواتر لەلایەن (إیم. إیم. شریف) ەوە کۆکراونەتەوە و کراوە بە ئینگلیزی و بەچاپ گەیەنراون.

٦- **اليهود والنصارى** بریتیە لەو نووسینانەی کە لە بارەی (جوولەکە) وە نووسیونی لەسەرجەم کتێبەکانی دا، دواتر لەلایەن مامۆستا (نعیم الصدیقی) ەوە کۆکراونەتەوە و کراوە بە عەرەبی و بەچاپ گەیەنراون.

٧- **إلى أي شيء يدعو الإسلام؟** بریتیە لە باسێکی تێرو تەسەل کە لەلایەن (ئەنجومەنی ئیسلامی ئەوروپا) وە داوای لێکرابوو بینووسێ، دواتر لە (کۆنگرەی ئیسلامی دەولی) لە (لەندەن) پێشکەشی بکات، ئەم کۆنگرەیە لە ساڵی (١٩٧٦) لە (لەندەن) بەستراوە.

٨- **ذبائح أهل الكتاب** ئەم کتێبە بە زمانی (ئوردی) نووسیویەتی بەناو (التفهيمات) ، دواتر لەلایەن مامۆستا (خليل الحامدی) یەوە وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبی و، لەلایەن (دار العروبة للدعوة الإسلامية بلاهور) ساڵی (١٩٧٥)

بەچاپ گەیەنراوە.

٩- المسلمون والصراع السياسي الراهن : (سێ بەشە) .

١٠- مطالب الإسلام تجاه المرأة المسلمة: ساڵی (١٩٥٣) نووسیویەتی.

**هەژدەیەم: ئەو کتێبانەی کە پێش بانگەوازی ئیسلامی نووسیونی :**

**أ- کتێب و دانراوەکانی :**

١- مجازر اليونانيين في سمرنا.

٢- النشاطات التبشيرية في تركيا.

٣- مسألة الخلافة.

٤- الأخلاق الاجتماعية وفلسفتها.

٥- مصدر قوة المسلم.

٦- الجهاد في الإسلام.

٧- مسألة اللباس.

٨- الدولة الصفوية والإستعمار البريطاني.

٩- تأريخ السلاجقة.

١٠- تأريخ الدّكن السياسي.

**ب- وەرگێڕانەکانی لە زمانی عەرەبیەوە بۆ زمانی ئۆردی :**

١- الإسلام والإصلاح للشيخ عبدالعزيز الجاويش.

٢- تحرير المرأة للأستاذ قاسم أمين.

٣- تأريخ الإسلام لإبن الخلكان.

٤- الأسفار الأربعة للشيخ صدرالدين الشيرازي.




ئیمام مەودودی لە کاتی نووسیندا

## ١٢) مێژووی کۆچی دوایی [١]:

لـەمانگی (٥) ی سـاڵی (١٩٧٩) بـەهۆی تێکچـوونی بـاری تەندروسـتی و بـە مەبەستی سەردانی دکتۆر دەچێتە شاری (بفیلو) ی ئەمریکا بۆلای دکتۆر (ئەحمەد) ی کوڕی و لەوێ دەمێنێتەوە تا لە بەرواری (٣٠) ی (ذوالقعدة) ی سـاڵی (١٣٩٩) ی کۆچـی بەرامبـەر (٢٢ / ٩ / ١٩٧٩) ی زایـین لـە نەخۆشـخانەی (بافلـد) لـە شـاری (نیویۆرك) ی ئەمریکا کۆچی دوایی دەکات و ڕۆحی پیرۆزی شاد دەبێتەوە بە خوای بەرزو بالآ.

دواتر لە مەراسیمێکی پڕشکۆدا بە فڕۆکەیەکی تایبەت تەرمەکەی لە ئەمریکاوە دەهێننەوە بۆ (پاکستان) و، لە گەڕەکی (الأجهرة) لە شاری (لاهـور) لـە (٢٦ / ٩ / ١٩٧٩) دەینێژن.

---

(١) (هەمان سەرچاوەی پێشوو / ص ١٦٢) .



سید مودودیؒ کا جنازہ قذافی سٹیڈیم لے جایا جا رہا ہے۔

تەرمی نیمام مەودودی لە ڕۆژی ناشتنیدا



علامہ یوسف القرضاوی جنازے سے قبل سید مودودیؒ کو خراج عقیدت پیش کر رہے ہیں

وتاری یوسف قەرزاوی پێش ناشتنی تەرمی نیمام مەودودی

**١٣) ئەو كتێبانەی كە لەسەر (مەودودی) نووسراون بە زمانی عەرەبی لەوانە :**

**١- أبو الأعلى المودودي: حياته وفكره العقدي: حمدي بن صادق الجمال. دار المدني للطباعة والنشر والتوزيع، جدة ( ١٤٠١هـ = ١٩٨٦م) .**

**٢- أبو الأعلى المودودي فكره ودعوته: د. سمير عبد الحميد إبراهيم، دار الأنصار. القاهرة ١٣٩٩هـ =١٩٧٩م .**

**٣- أبو الأعلى المودودي والصحوة الإسلامية: د. محمد عمارة، دار الشروق بالقاهرة. ١٤٠٧هـ = ١٩٨٧م.**

**٤- النهضة الإسلامية في سير أعلامها المعاصرين: د. محمد رجب البيومي، ج/ ٣، مجمع البحوث الإسلامية بالقاهرة ١٤٠٢هـ .**

**٥- من أعلام الحركة والدعوة الإسلامية المعاصرة. المستشار عبد الله العقيل.**

**١٤) ستایشی زانایان لە بارەی پێشەوا (مەودودی) یەوە :**

**یەكەم : (ئەبولحەسەنی نەدەوی) :**

**بەڕاستی من كەسێ ناناسم كە وێنەی (مەودودی) كاریگەری لەسەر نەوەی نوێی ئیسلامی هەبووبێ، هەم لە ڕووی فیكری و هەم لە ڕووی كرداریەوە، وە بەڕاستی بانگەوازەكەی لەسەر بنچینەی عیلم و زانست دارێژرابوو..**



**(أبوالحسن الندوی)**

**دووەم : شەهیدی ئیسلام (سەید قوتب) :**

هەمیشە مامۆستای شەهید کاتێ بیویستایە ناوی (مەودودی) بهێنێ بە (موسوڵمانە مەزنەکە) ناوی دەهێنا [1] .



سەید قوتب

**سێیەم : (محمد ئیقبال) :**

دەڵێ : (إن هذا الشيخ يعرض دين الرسول (ﷺ) بقلم مداده الدم) .



محمد إقبال

---

(١) پێشەوا (مەودودی) ش لەسەر مامۆستای شەهید (سەید قوتب) قسەیەکی بەناوبانگی هەیە و دەڵێ : (إن ما ورد في كتاب معالم في الطريق هو نفس ما أراه، بل كأنني أنا الذي كتبته، فقد عبّر عن أفكاري بدقة) واتە: بەڕاستی ئەوەی کە لە کتێبی (معالم في الطريق) دا هاتووە کتومت ئەوەیە کە من باوەڕم پێیەتی، بەڵکو نە هەر ئەوە دەڵێی هەر خۆم ئەو کتێبەم نووسیوە، بێگومان زۆر بە جوانی و بە وردی لەو کتێبەدا تەعبیری لە فیکر و بیرکردنەوەی من کردووە.

**چوارەم : (عومەر تەلمەسانی) :**

دەڵێ : (إنهما بحق إماما الجيل الظاهران المنفردان.. وإنهما استمدا كل معلوماتهما ومناهجهما وأساليبهما ووسائلهما في الدعوة إلى الله من القرآن وسنة الرسول (ﷺ) ، دون أخذ من هذا الفيلسوف أو استمداد من ذلك الكاتب، فجاءت مدرستهما بعيدة كل البعد عما قد يعيب الدعوة الإسلامية بأي فهم أو تفكير لا صلة له بالإسلام. والناظر إلى ما لاقاه البنا من عنت وتهجم وإيذاء يرى نفس الشيء بالنسبة للإمام المودودي .. وكأنهما على ميعاد) .



**عومەر تەلمەسانی**

**پێنجەم : ڕاوێژکار (عبدالله عوقەیل) :**

دەڵێ : عەللامە مەودودی یەکێکە لە زانا ناودارەکانی ئیسلام ، وە یەکێکە لە بیرمەندەکانی ناو ئیسلام ، وە یەکێکە لە بانگەوازکارەکانی ئیسلام ، چونکە خوای گەورە حیکمەت و دانایی پێ بەخشیوە، هەروەها تێگەیشتنێکی زۆر قوڵی پێ بەخشیوە، وە ئارامی و خۆڕاگری لەسەر عیلم و زانستی پێ بەخشیوە، وە وردبوونەوە و تێڕامانی لە واقیع پێ بەخشیوە..



**موستەشار عبدالله عوقەیل**

**١٥) پەیوەندی نێوان ئیخوان موسلیمین و پێشەوا مەودودی:**

**لەو نامەیەی کە (ئەحمەدی کوڕی پێشەوا بەننا) بۆ کۆنگرەی (کۆمەڵی ئیسلامی پاکستان) ی ناردووە تێیدا هاتووە [1] :**

ئێمە لەلای خۆمانەوە زۆر ڕێز و ئیحتیرام لە فیکر و کاری ئیمام مەودودی دەگرین و بە سەرمەشقی سەرکردە ئیسلامیەکانی هەموو وڵاتانی جیهانی دەبینین، وە سووربوونی بزووتنەوە ئیسلامیەکان لەسەر یادکردنەوەی سەرکردەکانیان واتای قوڵی خۆی هەیە، وە مەبەست لەو یادکردنەوانە بە گەورەکردن و پیرۆزکردنی ئەو جۆرە کەسانە نیە، بەڵکو بۆ ئەوەیە کە بکرێنە سەرمەشق و چاویان لێ بکرێ ، جا زیندووکردنەوەی یادی ئەم جۆرەکەسانە بە نییەتی ئیشکردن بۆ ئیسلام لەوپەڕی بایەخ و گرنگیدایە.

وە بەڕاستی من زۆر لە مێژە لە نزیکەوە بەدواداچوونم کردووە بۆ فیکر و کاری ئیمام (ئەبوئەعلای مەودودی) ، وە لە دوای شەهیدکردنی ئیمام (حەسەن بەننا) لە ساڵی (١٩٤٩) ، وە دەرکردنی بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵ (ئیخوان موسلیمین) ، وە گرتن و ڕاپێچکردنی ئەندامەکانی بۆ زیندان، وە قەدەغەکردنی ئاهەنگ گێڕان بە بۆنەی شەهیدکردنی بەنناوە، تاکە جەماعەیە کە (کۆمەڵی ئیسلامی پاکستان) بوو بە سەرکردایەتی ئیمام (ئەبوئەعلای مەودودی) هەموو ساڵێ لە ڕۆژی (١٢) ی فێبرایەر هەڵدەستا بە یادکردنەوەی شەهیدکردنی ئیمام (حەسەن بەننا) ، وە هەرگیز ئەم کارەی ئیمام (ئەبوئەعلای مەودودی) مان لەبیرناکەین و لەبیر ناچێتەوە.

---

(١) لە سایتی (دار الأنصار) وەرگیراوە.

وە لە ساڵی (١٩٦٨) مامۆستا مەودودی سەردانی (قاهیرە) ی کرد و، منیش لە پێشوازی بەخێرهاتنیدا لە پێشەوەی خەڵکەکە بووم، وە ئەو ماوەیەی کە لە (سیناء) بوو زۆر خۆشحاڵ بووم کە لە خزمەتیدا بووم، وە هەندێ سەردانم بۆ ڕێکخست بۆ شوێنە پیرۆزەکان لە (طور سیناء) ، وە ئەوەی لە یادمە سەردانی (ئەهرامەکان) و (شوێنەواری فیرعەونەکان) ی ڕەفزکردو نەهات، وە لە کۆتایی سەردانەکەیدا وێنەیەك لە کتێبی (الفتح الرباني) باپیرم بە هەدیە پێدا، وە لە دوای ئەوەی کە گەڕایەوە بۆ پاکستان نامەیەکی سوپاس ئامێزی بۆ ناردم بەهۆی ئەو میواندارییەی کە لە (قاهیرە) لێم کردبوو.

کاتێکیش کە کۆچی دوایی کرد داوام لە مامۆستا (عومەر تەلمەسانی) کرد – کە لەو کاتەدا مورشیدی ئیخوان موسلیمین بوو– کە دەمەوێ سەفەری پاکستان بکەم بۆ سەرەخۆشی کردن لە کەس و کاری ئیمام مەودودی، وە فیعلەن ئەویش ڕازی بوو، وە مامۆستا (کەمال سەنانیری – ڕەحمەتی خوای لێ بێ) نارد لەگەڵما تا لەو سەفەرەدا هاوەڵیم بکات.

وە سەبارەت بە (کۆمەڵی ئیسلامی پاکستان) و سەرکردەکەی قازی (حسێن ئەحمەد) ، پەیوەندیەکی پتەوو بەهێزمان پێکەوە هەیە و، وە لە زۆربەی ئەو کۆنگرانەدا کە لە (لاهور) و (لەندەن) و (ئەستەنبوڵ) دەبەسترێ هەر کاتێ دەرفەت ببێ بەیەك دەگەین و چاومان بەیەك دەکەوێ.

سەرچاوەکان :

١. أبوالأعلى المودودي عصره .. حياته .. دعوته .. مؤلفاته / تأليف : أليف الدين الترابي، الطبعة الأولى (١٤٠٧ هـ – ١٩٨٧ م) .

٢. أبو الأعلى المودودي: حياته وفكره العقدي / حمدي بن صادق الجمال ـ دار المدني للطباعة والنشر والتوزيع، جدة (١٤٠١هـ = ١٩٨٦م) .

٣. أبو الأعلى المودودي فكره ودعوته / د. سمير عبد الحميد إبراهيم، دار الأنصار ـ القاهرة (١٣٩٩هـ =١٩٧٩م) .

٤. أبو الأعلى المودودي والصحوة الإسلامية / تأليف: د. محمد عمارة، دار الشروق بالقاهرة (١٤٠٧هـ = ١٩٨٧م) .

٥. من أعلام الحركة والدعوة الإسلامية المعاصرة / تأليف: المستشار عبد الله العقيل.

٦. چەند سەرچاوەیەکی ئینتەرنێت.

## پوختەیەك

## لە ژیاننامەی پێشەوا حەسەن بەننا



١) ناوی تەواوی

٢) شوێنی لە دایك بوون و پەروەردەبوونی

٣) ناوی باوك و دایك و برا و خوشكەكانی

٤) قۆناغەكانی خوێندن و پلەی زانستی و لێهاتوویی

٥) هاوسەرگرتنی پێشەوا بەننا

٦) هەڵسوكەوتی پێشەوا بەننا لەگەڵ كەسانی چواردەوریدا

٧) دید و تێڕوانینی پێشەوا بەننا بۆ چەمكە ئاینییەكان

٨) هەوڵ و تێكۆشان بۆ دامەزراندنی كۆمەڵ و بزووتنەوەیەكی ئیسلامی كە دواتر ناونرا بە كۆمەڵی برایانی موسوڵمان (الإخوان المسلمون)

٩) دانراوو نووسینەكانی

١٠) مێژووی شەهیدبوونی

١١) ئەو دە وەسێتەی كە (پێشەوا بەننا) بۆ برایان و دۆستانی كردبوو

١٢) ئەو كتێبانەی كە لەسەر (پێشەوا بەننا) نووسراون

١٣) هەندێ لە وێنەكانی پێشەوا بەننا

سەرچاوەكانی ئەم ژیاننامەیە

# پوختەیەك
# لە ژیاننامەی پێشەوا حەسەن بەننا



**١) ناوی تەواوی :**

(حەسـەن) ی کـوڕی (ئەحمـەد) ی کـوڕی (عبـدالرحمن) ی کـوڕی (محمـد) ی بەننای ساعاتی یە.

**٢) شوێنی لە دایك بوون و پەروەردەبوونی :**

لـە بـەرواری : (١٤ / ١٠ / ١٩٠٦) زایینـی بەرامبـەر(٢٥) ی شـەعبانی سـاڵی (١٣٢٤) کۆچی لە شاری (مەحمودیە) ی سەر بە پارێزگای (البحیرة) ، کە (١٥٠) کم لـە بـاکووری خۆرئـاوای (قـاهیرە) وە دوورە، لـە بنەماڵەیـەکی ئـایین پـەروەرو و خواناس لە دایك بووە و چاوی بە دونیا هەڵهێناوە.

پێشـەوا بـەننا سـەر بـە خێزانێکـی دێهـاتی مـام ناوەنـد بـووە ، کەلـە گونـدی (شمشـێرە) ی نزیـك شـاری (ڕەشـید) ی کـەنار دەریـا لـە دەلتـای (نیـل) دا بـە کشتوکاڵەوە خەریك بووە.



شاری مەحمودیە

**٣) ناوی باوك و دایك و برا و خوشکەکانی :**

**أ- بـاوکی** (شـێخ ئەحمـەد عبـدالرحمن بـەننا) ئیجـازەی زانسـتی هـەبووە و پێشنوێژی مزگەوت و لێکۆڵەری زانسـتی سوننەت بـووە، چـەندین پـەڕاوی لەسـەر فەرموودەی پیرۆز نووسیوە، گرنگترینیان پـەڕاوی (الفتح الربـاني في ترتیـب مسـند الإمام أحمد بن حنبل الشیباني) یە، باوکی خۆی بە قوتابی (شـیخ محمـد عبـده) [1] دادەنا.

وەکو پیشەش بەرگی پـەڕاوی دەگـرت و سـەعات سازیشـی دەکـرد ، هەربۆیـە نازناوی (الساعاتی) لێنرابوو.

---

(١) (**محمد عبده**) : لە ساڵی (١٨٤٨ م) لە گوندێکی سەر بـە کـەناری دەلتـای میصـری بـەناوی (مەحللەت نەسر) لـە دایـك و بـاوکێکی میصـری لـە دایکبـووە، لـە سـاڵ (١٨٦٦ م) چۆتە زانکۆی (ئەزهەر) و یەکێکیش بووە لە قوتابیانی (جەمالەدینی ئـەفغانی) ، لـە سـاڵ (١٩٠٥ م) کۆچی دوایی کردووە (محمد عبده إمام الحداثة والدستور ـ عبدالرزاق عبد / ص ٤٧) .





محمد عبده جمال الدين أفغانى



شێخ ئەحمەد عبدالرحمن بەننا
باوكی پێشەوا بەننا

ب- دایكـــی بـە (أم سـعد) ناسـرابوو كچـی پیـاوێكی چـێودار بـوو لـە گونـدی (شمشێره) .



دایكی پێشەوا بەننا

**ج- براكانی :**

**یەكــەم:** شـێخ (عبـدالرحمن) كـە (كۆمـەڵی ژیـاریی ئیسـلامی) لـە (قـاهیرە) دامەزرانــد، وە یــەكێك بــووە لــە ئەندامــە چــالاك و ســەرەتاییەكانی ئیخــوان و سەركردەیەكی وشیارو زرنگ بووە و، دواتر بووەتە ئەندامی (مكتب إرشاد) .





**شێخ عبدالرحمن براگەورەی پێشەوا بەننا**

**دووەم:** (محمد) كە دوای پێشەوا بەننا لەدیك بووە.

**سێیەم:** (عبدالباسـط) لـە سـاڵی (١٩١٥ م) لـە شـاری (مەحمودیـە) ی سـەر بـە پارێزگای (البحیرة) لە دایك بووە و، دوای تەواوكردنی قۆناغی سەرەتایی و ناوەندی چـووەتە كولییــەی (پــۆلیس) و بەســەركەوتوویی تــەواوی كــردووە، بــەڵام زۆر لــە خزمەتی ئەم سلكە نەماوەتەوە و لە سەرەتایساڵەكانی پەنجاكان وازی لێ هێناوە، وە ڕووی كردووەتە دەعوە و بانگەوازی ئیسلامی، جا بـۆ ئـەو مەبەسـتە لـە سـاڵی (١٩٤٨ م) دا لەگـەڵ چـەند هاوكارێكیـدا ڕێكخـراوی (فریـق الإنشـاد الإسـلامي) یـان دامەزراندووە.

هــەروەها لــە ســاڵی (١٩٥٠ م) دا گۆڤــارێكی ئەدەبیشــی دامەزرانــدووە بــەناوی (راية الحق) ، كە گۆڤارێكی فیكری و ئەدەبی بووە و، خۆی بە تەنها دەری كردووە.

دواتر چووەتە ڕیزی کۆمەڵی (برایانی موسوڵمانان) ە وە و، پاشان سەفەری کردووە بۆ عەرەبستانی سعودی و، لە شاری (ریاض) بووە بە (مستشار الثقافي) و هەر لەوێش نیشتەجێ بووە، وە لە ساڵی (١٩٦٥ م) لە شاری مەدینەی پیرۆز کۆچی دوایی کردووە.



وێنەی عبدالباسط لەگەڵ فەوزیەی خوشکیدا

**چوارەم:** (جەمال) لە (١٥ / ١٢ / ١٩٢٠ م) لە شاری (مەحمودیە) ی سەر بە پارێزگای (البحيرة) لە دایك بووە و، دوای تەواوکردنی قۆناغی سەرەتایی و ناوەندی چووەتە کولییە و، پاشان کولیەی بەسەرکەوتوویی تەواو کردووە و ، دواتر بووەتە نووسەرێکی کارامە و لەم بوارەدا توانیویەتی کتێبێکی زۆر بەرهەم بهێنێ لەوانە:

١. المرأة المسلمة بين تحرير القرآن وتقييد الفقهاء.
٢. الحجاب.
٣. جواز إمامة المرأة الرجال.
٤. قضية الفقه الجديد.
٥. الإسلام والعقلانية.
٦. حرية الاعتقاد في الإسلام.
٧. الأصول الفكرية للدولة الإسلامية.
٨. ما بعد الإخوان المسلمين.

٩. مسؤولية فشل الدولة الإسلامية في العصر الحديث.

١٠. قيمة العدل في الفكر الأوروبي والفكر الإسلامي.

١١. نحو فقه جديد (٣ أجزاء) .

١٢. قضية الفقه الجديد.

١٣. الإسلام هو الحل.

١٤. رسالة إلى الدعوات الإسلامية المعاصرة.

١٥. خطابات حسن البنا الشاب إلى أبيه.

١٦. البرنامج الإسلامي.

١٧. كلا ثم كلا.

١٨. العودة إلى القرآن.

١٩. الربا.

٢٠. قضية الحرية في الإسلام.

٢١. سيادة القانون والحكم بالقرآن.



**وێنەی جەمال و فەوزیە و عبدالباسگ پێکەوە**




**جەمال برا گچکەی پێشەوا بەننا**

**د- خوشـــکەکانی** (فاتیمـە) هاوســەری مامۆسـتا (عبـدالحکیم عابـدین) بـوو، و (فەوزیە) هاوسەری پارێزەر (عبدالکریم منصور) بوو.




**عبدالحكیم عابدین عبدالكريم منصور**




**عبدالکریم منصور لەگەڵ دایکیدا فەوزیە خانم لە تەمەنی پیریدا**

### ٤) قۆناغەکانی خوێندن و پلەی زانستی و لێهاتوویی :

پێشەوا حەسەن بەننا لە بنەماڵەیەکی خوانـاس و زانست دۆستدا پێگەیشـت، سەرەتا لە خوێندنگای ڕەشادی ئایینی [١] لای شێخ (محمد زهـران) خوێنـدکار بـوو، مامۆسـتاکەی کـە دووەمـین کـەس بـوو دوای بـاوکی کاریگـەری باشـی هـەبووە لـە پێگەیشتن و گەشەکردنی ئەم خوێندکارە گچکەیە.

پێشەوا بەننا دەربارەی ئەم مامۆستایەی دەفەرموێ: ئەو پیاوە لەگـەڵ ئەوەشـدا زانستی پەروەردە و دەروونناسی نەخوێندبوو کەچی لەوانە بێژیدا شێوازێکی کاریگەر و بەرهەمداری هەبوو و پەیوەندی ناخەکی لەگەڵ خوێندکارەکانیدا دروست دەکـرد، لـەو ماوەیـەدا زۆر هەسـتم بـە خۆشەویسـتی زیـادی مامۆسـتا دەکـرد و منـیش ئـەوم زیـاد خۆشدەویست. لەم قۆناغەدا تەمەنی (٨ – ١٢) ساڵی بەسەر برد [٢] .

پاشتر چوویە ئامادەیی (مەحمودیە) ، لەو ماوەیەدا زۆر زوو بایـەخی بـە کـاری ئیسـلامیدا، لەگـەڵ هەنـدێ لـە هاوەڵانیـدا بەسەرپەرشـتی (شـێخ محمـد ئەفەنـدی) کۆمەڵەی (الأخلاق الأدبية) و پاشان کۆمەڵەی (منـع المحرمات) یان دامەزراند و هـەر لەوێ ئاشنایی لەگەڵ (الطريقة الحصافية) ی سۆفییەتیدا پەیدا کرد [٣] .


أول صورة للامام الشهيد عندما كان سنه قرابة الثالثة عشر



**پێشەوا بەننا لە تەمەنی لاوێتیدا**

---

(١) ئەم قوتابخانەیە لە ساڵی (١٣٣٣) ی کۆچی بەرامبەر (١٩١٥) میلادی بنیات نراوە.

(٢) (مذكرات الدعوة والداعية / حسن البنا ــ ص ١٤) .

(٣) (الإخوان المسلمون كبرى الحركات الإسلامية / إسحاق موسى الحسيني ــ ص ٤٧) .

پێشەوا بەننا لەو ماوەیەدا کاتەکانی دابەش کردبوو، بەیانیان خەریکی وانە خوێندن و دوای عەصر تا کاتی عیشا بە سەعات سازییەوە خەریك دەبوو، پاشان تا کاتی خەوتن پیاچوونەوەی وانەکانی دەکرد و دوای نوێژی بەیانیش ئەندازێك قورئانی لەبەر دەکرد [١] .

پێشەوا بەننا دوای ئەوەی بۆ خوێندن چوویە خوێندنگای مامۆستایانی (دەمەنهور) ، لەسەر هاوبەشی کردن لە چالاکییە نیشتیمانیەکان کە دژ بە ئینگلیز و دارو دەستەکەی دەکران، بەردەوام بوو، چونکە باوەڕی وابوو خزمەتکردن بە نیشتمان ئەرکێکی ئایینیە، دەبێت ئەنجام بدرێت [٢] .

پێشەوا بەننا لە ساڵی (١٩٢٠ م) دا ڕووی لە خانەی مامۆستایانی (دەمەنهور) کرد، هەرچەندە دوو کۆسپ لەبەردەمیدا هەبوون ..

یەکەمیان: کۆسپی تەمەن ، کە ئەو دەمە تەمەنی چواردە ساڵ و نیو بوو، مەرجی ئەو خانەیەش بۆ قبوڵ کردن گەیشتن بوو بە پانزە ساڵی.

کۆسپی دووەمیان: ئەوەبوو هێشتا هەموو قورئانی لەبەر نەکردبوو .. بەڵام سەرپەرشتیاری خانەکە مامۆستا (بشير الدسوقي) چاوپۆشی گرفتی تەمەنەکەی لێ کردو بەڵێنی لێوەرگرت کە ئەو چواریەکەی قورئان کە هێشتا لەبەری نەکردبوو لەبەری بکات، پێشەوا بەننا لەو ماوەیەدا بە شێوەیەکی گونجاو کاتەکانی ڕێکخستبوو، ڕۆژەکانی دەوامی لەوێ بەسەر دەبرد و دوای نیوەڕۆی پێنج شەممە دەگەڕایەوە بۆ (مەحمودیە) و بەیانی شەممە دەگەڕایەوە بۆ (دەمەنهور) .

لە (مەحمودیە) لە ڕۆژدا سەعات سازی دەکرد و شەویش لەگەڵ برایانی ڕێڕەوی (الحصافية) دا خەریکی ویرد و زیکر بوو.

---

(١) (مذكرات الدعوة والداعية / حسن البنا ــ ص ١٥) .

(٢) (ظروف النشأة وشخصية الإمام المؤسس / جمعة أمين ــ ص ١٧٩) .

لەو ماوەیەدا ئەزموونی لێهاتوویی (الكفاءة) ی دا ، لە خوێندنگاکەی خۆیان یەکەم و لەسەر ئاستی وڵات پێنجەم بوو[1] .

لە ساڵی (١٩٢٣ م) دا لە (دار العلوم) ی (قاهیرە) وەرگیرا. لەوێ ئاسۆی نوێ و فراوان لەبەردەمیدا والابوو ، جگە لە هاوبەشی کۆڕەکانی پەیڕەوانی (الحصافیة) ی سۆفییەتی، سەردانی کتێبخانەی (السلفیة) ی دەکرد و لەوێ پەیوەندی لەگەڵ کۆمەڵێك زانا و پیاوچاکان دروست کرد، لە سەرووی هەموویانەوە (محب الدین الخطیب) .



پێشەوا بەننا لە تەمەنی پێگەیشتندا



محب الدین الخطیب

(١) (مذكرات الدعوة والداعیة / ص ٤٦)

هەروەها هاوبەشی (کۆڕی زانایانی ئەزهەر) ی دەکرد، کە شێخ (محمد رشید رضا) سەرۆکیان بوو.



محمد رشید رضا



زانکۆی ئەزهەر

کاتێك لە ساڵی (١٩٢٧ م) دا (دار العلوم) ی بە یەکەمی تەواو کرد، بە مامۆستا لە شاری (ئیسماعلییە) ی کەناڵی (سویس) دامەزرا.

**کەواتە مامۆستاکانی پێشەوا بەننا بەپێی تەمەنی خوێندنی بریتی بوون لە :**

**یەکەم:** شێخ ئەحمەد عبدالرحمن بەنننای باوکی.

**دووەم: شێخ محمد زەهران:** کە یەکێك بووە لە زاناکانی (مەحمودیـە) و، خـەریکی شارەزاکردن و فێرکردنی منالآنی ئەو ناوچەیە بووە لە خوێندنەوە و تەعلیمی قورئـانی پیرۆزدا و، وە وتاری بۆ خەڵکی داوە لە مزگەوتدا و، وە وانەشی بە ئافرەتان وتۆتـەوە لە ماڵی خۆیدا و، وە کەسێکی زۆر بە هیممەت بووە لە بواری بانگەوازدا.

تا لە ساڵی (١٩١٥) دا هەڵدەستێ بە دامەزراندنی قوتابخانەی (الرشاد الدينية) لە (مەحمودیە) بۆ پێگەیاندن و پەروەرکردنی منداڵان.

**سێیەم: شێخ عبدالوهاب حەصافی:** شێخی ڕێبازی حەصافیە بووە لە (دەمەنهور) و جێنشینی (شێخ حسنین) ی باوکی بووە، ئەو کاتەی پێشەوا بەننا بە خزمەتی (شێخ عبدالوهاب) دەگا لە (دەمەنهور) لە قوتابخانەی (المعلمین) لە خوێندندا بوو.



شێخ عبدالوهاب حەصافی

**چوارەم : شێخ محمد ئەبوشوشە :** یەکێ بوو لە بازرگانەکانی مەحمودیە و پیاوێکی صاڵەح بوو، کە دەورێکی باڵای هەبوو لە پەروەردەکردن و خوڕەوشتی جوانی پێشەوا بەننادا.

**٥) هاوسەرگرتنی پێشەوا بەننا :**

لە ساڵی (١٩٣٢ م) دا کاتێك لە (ئیسماعیلییە) بوو، لە خێزانێکی بازرگانی ماماوەندی ئەوێ، بە ناوی خانەوادەی (الصولی) هاوسەری گرت، لەو هاوسەرەی شەش کچ و دوو کوڕی بووە، کچەکانی بریتی بوون لە :

١- **وەفا :** هاوسەری بانگەوازکاری کۆچ کردوو (سەعید ڕەمەزان) بوو.

٢- **سەنا :** مامۆستایە لە کولیەی کچان لە میصر.

٣- **ڕەجا :** دەرچووی کۆلیجی کچانە.

٤- **صەفا** : هەر لە ژیانی خۆیدا کۆچی دوایی کردووە.

٥- **هالە** : مامۆستایە لە کۆلیجی طب.

٦- **ئیستیشهاد** : وانەبێژە لە زانکۆی (مەلیك سعود) لە سعودیە.

(سەنا) ی کچی پێشەوا بەننا دەڵێ : دوا منداڵی باوکم (ئیستیشهاد) بوو جا کاتێ لە دایك بوو باوکم شەهید بوو بوو، هەر بۆیە باپیرم ویستی ناوی بنێ (دماء) بەڵام فەرمانبەرەکەی نەخۆشخانەکە بەو ناوە ڕازی نەبوو، پاشان باپیرم ناوەکەی گۆڕی بۆ (ئیستیشهاد) کەچی فەرمانبەرەکە بەو ناوەش ڕازی نەبوو ، بەڵام باپیریشم کۆڵی نەدا و وتی : بەخوا هەر ناوی دەنێم (ئیستیشهاد) پێت خۆش بێ یانا ، ئەگەرنا بێ ناو قەیدی دەکەم با ناوی تۆمار نەکرێ لە سجلاتی حکومەتدا ، ئیتر لە دواییدا بە مەجبوری فەرمانبەرەکە ناوی (ئیستیشهاد) لە سجلاتدا تۆمار کردبوو، ئەو کاتەی کە باوکمان شەهیدکرا تەمەنمان بەم شێوەیە بوو : (وەفا) حەڤدە ساڵ بوو ، (ئەحمەد) چواردە ساڵ و نیو بوو، (سەنا) یانزە ساڵ و نیو بوو.. (١)



پێشەوا بەننا و منداڵەکانی



ئەو خانووەی بەننای تێدا ژیاوە

(١) لە سایتی (الملتقى) وەرگیراوە.




إستشهاد کچە گچکەی بەننا     سەنا سێیەم منالی بەننا

دوو کوڕەکەشی بریتین لە :

١- **(ئەحمەد)** : کە ناسراوە بە (سیف الإسلام) ئێستا لە ژیاندایە و پارێزەرە.

٢- **(محمد)** : کە ناسراوە بە (حسام الدین) هەر لە ژیانی خۆیدا کۆچی دوایی کردووە.

بەپێی گەورە و بچووکیش منداڵەکانی پێشەوا بەننا بەم شێوە بووە : (وەفا ، ئەحمەد ، سەنا ، محمد ، ڕەجا ، صەفا ، هالە ، ئیستیشهاد) .



ئەحمەد حەسەن بەننا

**٦) هەڵسوکەوتی پێشەوا بەننا لەگەڵ کەسانی چواردەوریدا :**

پێشەوا بەننا لەناو خێزانەکەیدا چ لە ڕووی بیرکردنەوە و چ لە ڕووی ڕەفتارەوە پابەندبوو بە ئاکارە ئیسلامیەکانەوە، کوڕێکی گوێڕایەڵ بوو بۆ دایك و باوکی و ،

هاوســەرێکی دڵســۆز و دڵپــڕ لــە خۆشەویســتی بــوو بــۆ هاوســەرەکەی، بــاوکێکی میهرەبــان و بــە ســۆز بــوو بــۆ منداڵــەکانی، برایــەکی ڕەوشــت جــوان بــوو بــۆ بــراو خوشکەکانی، پەروەرشکار و ئامۆژگار بوو بۆ هــەموویان، بەجێهێنــەری پەیوەنــدی خزمایەتی خزمانی خۆی و هاوسەرەکەی بوو.

**(سەنا) ی کچــی بۆمــان دەگێڕێتــەوە و دەڵــێ :** نــەك هــەر هەســتمان بــە ڕەقــی نەدەکرد لێی، بەڵکو لە سۆزو بەزەیی و میهرەبانیدا نغرۆی دەکردین، بــە جــوانترین ناوو جوانترین شێوە بانگی دەکردین، دەگەڕا بە سەرماندا تا دڵنابێــت کــەسمان لــە خەودا دەرنەکەوتووین.. دەگەڕایەوە ماڵ ئەو شــیوەی کــە پێشــتر بــۆی ئامــادەبوو دەیخوارد، بێ ئەوەی دایکم یان کەسێکی ترمان بێدار بکاتەوە.

**(ئەحمــەد) ی کــوڕی بۆمــان دەگێڕێتــەوە و دەڵــێ :** بــاوکم تــا ئەوپــەڕی ئاســت میهرەبان بوو، ڕەچاوی هەستی منداڵی دەکردین، زۆر بە توانا بــوو لــەوەدا وامــان لێ بکات گوێڕایەڵی بین بێ ئەوەی پێمان بڵێت.

**٧) دید و تێڕوانینی پێشەوا بەننا بۆ چەمکە ئاینیەکان :**

لــە پــەیامی (التعــاليم) دا کــە پــەیامێکی کــورتی پێشــەوا بەننایــە و ئاڕاســتەی برایانی کردووە، بەو ئومێدەی کە تەنها بۆ زانیاری یان تەنها بۆ لەبەرکردن نــەبێت، بەڵکو جێ بەجێی بکەن.

ئەو پەیامە کە بە بیست بنچینەکە **(الأصول العشـرين)** ناسـراوە و دیـدی برایـان بەرامبەر چــەمکە ســەرەکییەکانی ئــایینی ئیســلام و دەربــارەی بیروبــاوەڕیش ڕوون دەکاتەوە وەرگێراوە کە بریتین لە :

**بنەمای یەکەم :** ئیسلام سیستمێکی گشــتگیرە، هــەموو ڕووەکــانی ژیــان لــەخۆ

دەگرێت، ئیسلام دەوڵەت و نیشتمانە هەروەك حكومەت و گەلە، ڕەوشت و هێزە هەروەك ڕەحمەت و دادپەروەریە، سەروەت و سامانە هەروەك كەسابەت و دەوڵەمەندیە، جیهاد و بانگەوازە هەروەك سوپا و فیكرەیە، هەروەها بیروباوەڕێكی ڕاستەقینە و، پەرستشێكی دروستە وەك یەك.

**بنەمای دووەم** : قورئانی پیرۆز و سوننەتی پاك لە ناسینی حوكمەكانی ئیسلامدا سەرچاوەن بۆ هەموو موسوڵمانێ ، تێگەیشتن لە قورئان بە گوێرەی ڕێساكانی زمانی عەرەبی دەبێت، بەبێ زۆر لەخۆكردن و زیادەڕۆیی، بۆ تێگەیشتن لە سوننەتیش دەگەڕێینەوە بۆلای پیاوانی متمانە پێكراوی بواری فەرموودە.

**بنەمای سێیەم** : باوەڕی ڕاستەقینە و پەرستشی دروست و تێكۆشان نوورو شیرینیەكی هەیە خوای گەورە دەیهاوێتە دڵی هەركەسێ خۆی بیەوێ، بەڵام خورپە و شت بۆ دەركەوتن و خەوبینین نابنە بەڵگەی حوكمە شەرعیەكان و، ئیعتیباریان پێ ناكرێت مەگەر لەگەڵ حوكم و دەقەكانی ئاییندا پێچەوانە نەبن.

**بنەمای چوارەم** : نوشتە و پەت و موورو و ڕمڵ لێدان و چارەنووس زانین و قسەكردن لە زانینی غەیب و هەموو شتێك لەو بابەتانە خراپ و بێ شەرعین، پێویستە نەهێڵرێن و دژایەتی بكرێن. سا مەگەر ئایەتێكی قورئان، یان نزایەك بێت لە پێغەمبەرەوە.

**بنەمای پێنجەم** : ڕای پێشەوای موسوڵانان و جێگرەكەی لەو مەسەلانەدا كە دەق دەربارەیان نەهاتووە، لەوانەشدا كە دەگونجێ چەند ڕوویەكی تری هەبێت، هەروەها لە (مصالح المرسلة) شدا كاری پێ دەكرێت بە مەرجێ بەرەنگار نەبێتەوە لەگەڵ ڕێسایەكی شەرعیدا، ئەو ڕایەش بە گوێرەی بارودۆخ و نەریت و عادەتی خەڵكی دەگۆڕێت. مەبەستیش لە عیبادەت پەرستشە بێ ئاوڕدانەوە بەلای واتاكاندا بەڵام لەكاری ئاسایی و مامەڵەكاندا گەڕانە بەشوێن حیكمەت و نهێنی و مەبەستەكاندا.

**بنەمای شەشەم :** هەموو تاکێك لە وتەکانی وەردەگیرێت و لێیشی وەلا دەنرێت، جگە لە پێغەمبەری خوا کە لە گوناهو هەڵە بە دوورە.

ئەوەش لە پێشینە چاك و دیندارەکان وەرگیراوە کە لەگەڵ قورئان و سوننەتدا گونجاوو ڕێکـە وەری دەگـرین، ئەگـەرنا قورئـان و سـوننەت بـۆ گوێڕایـەڵی و شوێنکەوتن لە پێشترن ...

بەڵام بە تانە لێدان یان بریندارکردن لەسـەر ڕای جیـاواز ڕووبـەڕووی کەسـەکان نابینەوە و دەیانسپێرین بە نییەتی خۆیان، ئێستا ئەوان ئێرەیان بەجێ هێشتووە و چوون بۆلای خوای گەورە و ئەوەی کردوویانە دێتەوە ڕێتان.

**بنەمای حەوتەم :** هەر موسوڵمانێك نەگەیشتبێتە ئاسـتی تێگەیشـتن و تێـڕوانین لـە ناسـینی بەڵگـەکانی فەرمانـە شـەرعییەکاندا، بـۆی هەیـە شـوێن یـەکێك لـە پێشەواکانی ئاین بکەوێت و باشتریش وایە لەگەڵ ئەو شوێنکەوتنەدا چەند بتوانێت هەوڵ بدات، شارەزای ئەو بەڵگانە بێت کە پێشەواکەی کردوونی بـە بەڵگـە بـۆ هـەر فەرمانێك، هەروەها پێویستە ڕێنوێنی بەڵگەدار قبوڵ بکات لە هەرکەسێك کە بە زانا و خواناسی بزانێت، هەر وەکو ئەگەر خوێندەوار بوو پێویستە هەوڵ بدات ناتەواوییە زانستیەکانی خۆی تەواو بکات تاکو بگاتە پلەی تێگەیشتن و تێڕوانین.

**بنەمای هەشتەم :** جیاوازی تێگەیشتن لە فەرمانە شەرعییەکاندا نابێتـە هۆکـاری نـاکۆکی لـە ئاییـندا و نابێـت ببێتـە هـۆی دووبـەرەکی و کینـە، چـونکە هـەموو موجتەهیدێك پاداشتی خۆی هەیە، لەگـەڵ ئەوەشـدا ڕێگـە نـەگیراوە لـەوەی پرسـە جیاوازەکان لێکۆڵینەوەی زانستییان لەسەر بکرێت، تا لە سایەی خۆشەویستی و لە خوابووندا بتوانین بگەینە ڕاستی، بـێ ئـەوەی ئـەو لێکۆڵینەوەیـە ببێتـە مشـتومڕی خراپ و دەمارگیری.

**بنـەمای نۆیـەم :** هـەر بابـەتێك کـارێکی لەسـەر بوونیـاد نـەنرێت، باسـکردن و

لێکۆڵینەوە لێی، ئەو خۆڕەتاندنەوەیە کە لە شەرعدا لێمان قەدەغە کراوە.

لەوانە : زۆر لق و پەل کردنەوە لە ئەحکامی ئەو شتانەی هێشتا ڕوویان نەداوە، یان مانای ئایەتێك هێشتا زانست پەی بە ماناکەی نەبردووە، یان قسەکردن لەسەر پلە بەندی هاوەڵانی پێغەمبەر و چوونە ناو ئەو جیاوازییانەی لە نێوانیاندا گوزەراوە، چونکە هەر یەکەیان پلەی هاوەڵیی هەیە و پاداشتی بە پێی نییەتی خۆیەتی، چاك لێکدانەوەی کارەکانیان ، یان بێدەنگ بوون بۆ ئێمە چاکترین پەناگەیە.

**بنەمای دەیەم :** خوا بە یەکناسین و دووردانانی لە هەموو ناتەواوییەك، بەرزترینی بیروباوەڕەکانی ئیسلامن و، ئایەتەکانی قورئان و فەرمووده ڕاستەکان کە باس لە سیفەتەکانی خوا دەکەن و ئەوانەیان کە ئێمە لێیان تێ ناگەین، چۆن هاتوون بەو شێوە وەریان دەگرین و باوەڕمان پێیان هەیە و لە خۆمانەوە لێکیان نادەینەوە و لە کاریشیان ناخەین و ناچینە سەر ئەو باس و بابەتانەی زانایان لەسەری ناکۆکن، ئەوەندەمان بەسە کە پێغەمبەری خوا و هاوەڵانی بەسیان بووە.

ئەو بابەتانەی زانایانی شارەزا دەڵێن : باوەڕمان پێیان هەیە و هەموویان لەلایەن پەروەردگارمانەوە هاتوون :

﴿وَٱلرَّٰسِخُونَ فِى ٱلْعِلْمِ يَقُولُونَ ءَامَنَّا بِهِۦ كُلٌّ مِّنْ عِندِ رَبِّنَا﴾ (آل عمران : ٧).

**بنەمای یانزەیەم :** هەموو داهێنراوێك (بیدعە) یەك لە ئاییندا، کە بناغە و سەرچاوەیەکی نەبێت، خەڵکی بە حەزی خۆیان بە باشیان دانابێت زیاد یان کەمیان کردبێتەوە، ڕێ ونکردنە و پێویستە نەهێڵرێت و لەناو ببرێت، ئەوەش بە هۆکارو شێوازی گونجاو تا سەرنەکێشێت بۆ شتێکی خراپتر.

**بنەمای دوانزەیەم :** پەرستشە بێ سنوورەکان زیادکردنیان یان کەم کردنیان

یان پابەندبوون پێیانەوە، ئەمانە جیاوازی فیقهی نێوان زانایانن و هەر یەکەیان ڕای خۆی هەیە. هەوڵدان بۆ ساغ کردنەوەیان و گەیشتن بەڕاستی بە بەڵگەی ڕوون و ئاشکرا شتێکی چاکە.

**بنەمای سیانزەیەم** : خۆشویستنی پیاوچاکان و ڕێزگرتن و بە چاك باسکردنیان بەو کردەوە چاکانەی ئەنجامیانداوە هۆی نزیك کەوتنەوەیە لە خوا، ئەولیاش ئەوانەن کە خوا لە قورئاندا باسی فەرموون: ﴿أَلَآ إِنَّ أَوْلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ۞ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَكَانُوا۟ يَتَّقُونَ﴾ (یونس: ٦٢ – ٦٣).

بوونی کەرامەت بۆیان ڕەوایە، بەڵام بە مەرجە شەرعیەکانی و لەگەڵ باوەڕبوون بەوەی کە ئەوان بۆ خۆیشیان خاوەنی زیان و قازانج نین ، چ لە ژیانیاندا و، چ لە دوای مردنیان، چ جای ئەوەی شتێك بە کەسێکیتر ببەخشن.

**بنەمای چواردەیەم** : سەردانی گۆڕەکان هی هەر کەس بن، بەو شێوەی شەرع باسی دەکات سوننەتە، بەڵام کۆمەکخواستن لە گۆڕکراوەکان و هانا بردن بۆیان و داواکردنی جێ بەجێ کردنی پێویستی لێیان، لە دوور یان لە نزیکەوە و، نەزرکردن بۆیان و بیناکردنی گۆڕ و داپۆشینی و و چرا بۆ دانانی و دەست پیاهێنان و سوێندخواردن بە غەیری خوا و هەر شتێك لەم بابەتانە، پێویستە بە شێوازێکی دانایانە بەرهەڵستی بکرێت و لێکدانەوەی دروستیان بۆ ناکەین، تاکو دەرگا بە ڕوویاندا نەکرێتەوە.

**بنەمای پانزەیەم** : دروستی پاڕانەوە لە خوا بە خاترانەی کەسێك یان شتێك لە دروستکراوەکانی، جیاوازییەکی فەرعیە، چۆنیەتی نزاکردن لە پرسەکانی بیروباوەڕ نییە.

**بنەمای شانزەیەم** : باوی هەڵە ڕاستی وتە شەرعییەکان ناگۆڕێت، بەڵکو دەبێت

دڵنیابین لە سنووری ئەو مانایانەی کە مەبەستن لێیان و لەو ئاستەدا بوەستین، هەروەها پێویستە لە هەموو کاروبارێکی ئایینی و دنیاییدا لە خۆخەڵەتاندن و خەڵکی خەڵەتاندن بەدوور بین، چونکە مەبەست لە ناونراوەکاندایە نەك لە ناوەکاندا.

**بنەمای حەڤدەیەم :** بیروباوەڕ بناغەی کارکردنە، کاری دڵیش لە کاری ئەندامەکانی لاشە گرنگترە و بە دەست هێنانی تەواویی (الکمال) لە هەردووکیاندا داواکراوی شەرعە... هەرچەندە ئاستی داواکردنیان جیاواز بێت.

**بنەمای هەژدەیەم :** ئیسلام عەقڵ و ژیری ئازاد دەکات و هانی دەدات لە بوونەوەر بکۆڵێتەوە، هەروەها بایەخ بە زانست دەدات و ڕێزی زانست دۆستان دەگرێت و پێشوازی لە هەموو شتێکی بە سوود دەکات و هەروەکو پێغەمبەری سەردار فەرموویەتی: **((حیکمەت و دانایەتی ئەو ونبوویەیە کە باوەڕدار عەودالّیەتی و لە هەر کوێ دۆزییەوە ، ئەو شایستەترین کەسە پێی))** (١).

**بنەمای نۆزدەیەم :** جاری وا هەیە تێڕوانینی شەرعی و تێڕوانینی عەقڵی پێکەوە ڕێك ناکەون، بەڵام لە شتە یەکلابووەکاندا ناکۆك نین، هەرگیز سەلمێنراوێکی زانستی دژ بە بە ڕێسایەکی شەرعی جێگیر نیە، ئەوەی یەکلابووەتەوە لەگەڵ یەکلابووەکاندا ڕێکدەخرێت.

---

(١) ئاماژەیە بۆ ئەو فەرموودەیەی کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: ((الكَلِمَةُ الْحِكْمَةُ ضَالَّةُ الْمُؤْمِنِ فَحَيْثُ وَجَدَهَا فَهُوَ أَحَقُّ بِهَا)) ضعيف جداً — (ترمذی) لە کتابی (العلم) ، بابی : (ما جاء في فضل الفقه على العبادة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٦٨٧) ، هەروەها (ابن ماجە) لە کتابی (الزهد) ، بابی : (الحکمة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٤١٦٩) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (جامع الترمذي/ ج ٥ ، ص ٥١ ، ح ٢٦٨٧) ، و (سنن ابن ماجه / ج ٢ ، ص ١٣٩٥ ، ح ٤١٦٩)، و (ضعيف الجامع الصغير/ ح ٤٣٠٢) دا فەرموویەتی : (ضعيف جدا) ە.

ئەگەر هەردوو لایان گومانی بوون (واتە: یەکلانەبووبوونەوە) ئەوا تێڕوانینە شەرعییەکە پێش دەخرێت، تاکو تێڕوانینە عەقڵییەکە دەسەلمێنێ ، یان هەرەس دێنێت.

**بنەمای بیستەم :** ئێمە هەر موسوڵمانێك کە شایەتمانی دەربڕی و بە گوێرەی کاری کردو فەرزەکانی بەجێ هێنا، ئیتر بەهۆی ڕایەکەوە یان گوناهێکەوە بە کافری دانانێین، سا مەگەر خۆی دان بە بێ بڕوایی خۆیدا بنێت، یان نکۆڵی ئاشکرا و ناسراوێکی ئایین بکات یان حوکمێکی ئاشکرای قورئان بە درۆ دابنێت، یان تەفسیری قورئان بە شێوەیەك بکات لە شێوازەکانی زمانی عەرەبیدا جێگەیان نەبێتەوە، یان کارێك ئەنجام بدات بەبێ باوەڕیی نەبێت بە هیچی تر لێك نەدرێتەوە.






پێشەوا بەننا بە پۆشاکی مەلایەتیەوە

**٨) هەوڵ و تێكۆشان بۆ دامەزراندنی كۆمەڵ و بزووتنەوەیەكی ئیسلامی كە دواتر ناونرا بە كۆمەڵی برایانی موسوڵمان (الإخوان المسلمون) :**

پێشەوا بەننا كە لە ساڵی (١٩٢٨ م) دا كۆمەڵی برایانی موسوڵمانی دامەزراند، دكتۆر (ریتشارد میتشیل) نووسەری كتێبی (الإخوان المسلمون) دەربارەی دەدوێت و دەڵێت : كاتێك بەننا لە (قاهیرە) نیشتەجێ بوو كاتێكی پڕ لە جۆشی جونبوشی سیاسی و هزری بوو، كە میصری بیستەكانی سەدەی بیستەمی گۆڕی، ئەویش بە چاوی گەنجێكی گوندنشینی دیندار دەیڕوانیە ئەو دیمەنە ... ئەوەی لای ئەو گیروگرفتی كاریگەر بوو بەم شێوەیە دیاری كرد.

هەردوو پارتی (وەفد) [1] و (ئازادیخوازانی دەستووری سیاسی) بە ململانێی بە دەست هێنانی دەسەلاتی میصرەوە سەرقاڵ بوون و، گفتوگۆیەكی سیاسی توند و شپرزەییەكی دیار دوای شۆڕشی (١٩١٩ م) سیمای كۆمەڵگەی میصری ئەو ڕۆژگارە بوو.

---

(١) (**حیزبی وەفد**) بریتیە لە حیزبێكی شەعبی لیبرالی ، ساڵی (١٩١٨) ی زایین لەسەر دەستی (سەعد زەغلول و ، عبدالعزیز فەهمی و، عەلی شەعراوی و، ئەحمەد لوتفی و، كەسانی تر) دامەزراوە، ئەم حیزبە لە پێش شۆڕشی (٢٣) یولیۆی میصر، كە بووە هۆی لەناوبردنی دەستووری مەلەكی و هێنانی دەستووری جمهوری بۆ ولات زۆرینە بووە، بەلام دوای ئەو شۆڕشە ئیتر ئەم حیزبە نەیتوانی زۆرینە بەدەست بهێنێ و بە تەواوی چالاكیەكانی ئەنجام بدا هەتا هاتنی حوكمی (ئەنوەر سادات) كە ڕێیدا بە كاری فرە حیزبی، بەمجۆرە لەژێر ناوی (حیزبی وەفد) مایەوە تا ساڵ (١٩٧٨) ئیتر ناوی خۆی گۆڕی بۆ (حزب الوفد الجدید) ..







**بارەگا و ئارمى حيزبى وەفد**

- بانگەشە بۆ (ئيلحاد) و (ئازادى ڕەها) دەورى جيهانى ئيسلامى گرتبوو.
- هێرش کردنە سەر نەريت و بيروباوەڕەکانى خەڵك. ئەم هێرش کردنە شۆڕشى (کەماليزم) – کە خەلافەت و نووسينى عەرەبى وەدەرنا – پشتگيرى دەکرد و بە شێوازێکى پلاندار بزووتنەوەى (ڕزگارى هزرى و کۆمەلايەتى) پێى هەڵدەسا و پاشان ڕەوتە نا ئيسلاميەکانى ترى ميصر کە بۆچوونيان وابوو کۆمەڵگە نابێتە عەلمانى تاکو دژى ئاين شۆڕش نەکات و باوو نەريتە کۆمەلايەتييەکان تێك نەشکێنێت.
- جگە لەمانەش ئەو کۆڕ و ئاهەنگ و کۆمەڵە و پەڕاوو گۆڤار و ڕۆژنامانەى بازاڕى ئەو بيرو بۆچوونەيان گەرم دەکرد، تاکە ئامانجيان لاوازکردنى کاريگەريى ئاين بوو[1] .



**مصطفى كمال أتاتورك**

(١) (الإخوان المسلمون لريتشارد ميتشيل / ص ٧١ ـ ٧٢) .

کاردانەوەی ئەم وێنەیە لەسەر حەسەن بەننا و تێڕوانینی بۆیان بەم شێوەیە بوو، کە خۆی باسی لێوە دەکات و دەفەرموێ : جگە لە خوا کەس نازانێت چەندین شەومان دەبردە سەر بە باسی بارودۆخی نالەباری ئوممەتەوە کە چۆن گەیشتۆتە ئەو حاڵەتە نەخوازراوە و هۆکارەکانمان شیدەکردەوە و چارەسەرمان دیاری دەکرد، کاریگەریی ئەو بارودۆخە لەسەرمان هەندێ جار دەیگەیاندینە گریان.

کە حەسەن بەننا گەیشتە (قاهیرە) هەندێ پەیوەندی لەگەڵ پەیڕەوانی ڕێڕەوی (الحصافیة) کرد .. بەڵام سەرنجی دا سوود ناگەیەنێ ، بۆ ساڵی دووەم پەیوەندی کرد بە (کۆمەڵەی ڕەوشتە جوانە ئیسلامییەکان) ە وە، کە گرنگی بە موحازەرەدان دەدا لە بابەتە ئیسلامییەکاندا، بەڵام ئەوەش بۆ پڕکردنەوەی ئەو کەلێنە گەورەیەی کە لە نێوان موسوڵمانان و بیروباوەڕ و خواستەکانی ئەو بیروباوەڕەدا دروست بوو بوو بەس نەبوو.

دوای ئەوەی قەناعەتی بۆ دروست بوو خەمەکانی بوو بە خەمی بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕ بەناو خەڵکدا، کە تەنیا مزگەوت بۆ ئەو کارە بەس نەبوو، ئەو هەنگاوێکی تری پێنا ئەویش ئەوە بوو، کە لە قوتابیانی (ئەزهەر) و (دار العلوم) کۆمەڵێکی ڕێکخست، تا لەسەر کاری ئامۆژگاری و ڕێنمایی خۆیان ڕابێنن و پاش ماوەیەك ئەمانە بۆ ئامۆژگاری کردن چوونە ناو مزگەوتەکان، گرنگتر لەوەش ئەم ئامۆژگارییە کاتێك لە مزگەوتەوە گوێزرایەوە بۆ چایخانە و شوێنی کۆبوونەوەکانی خەڵك، سەرکەوتنێکی بەرچاوی بەدەستهێنا.

لەو ماوەیەدا پێشەوا بەننا پەیوەندی بە خاوەنی کتێبخانەی (السلفیة) ە وە کرد، کە ئەو کاتە (محب الدین الخطیب) بەڕێوەی دەبرد، هەروەها پەیوەندی کرد بە مامۆستا (محمد رشید رضا) وە، کە گۆڤاری (المنار) ی دەرکرد و، خەمەکانی بۆ

زاناكانى (ئەزهەر) باسكرد، كە لەسەر زمانى شێخ (دەجەوى) وەڵامیان دایەوە، با هەركەس بۆ خۆى كار بكات و خۆى لەم بەڵایە ڕزگار بكات.

تا لە كۆتاییدا لە ئادارى ساڵى (١٩٢٨ م) دا گەیشت بە كۆمەڵێك لە برایانى كە پێكەوە كۆمەڵى برایانى موسوڵمانیان دامەزراند بۆ ئەوەش بڕیارى دابوو قبوڵى هەرچى تاڵى و سەختى هەیە بیكات.



شێخ یوسف دەجەوى



یەكەمین كۆبوونەوەى پێشەوا بەننا لەگەڵ بەڕێوەبەرانى برایانى موسوڵمان لە ئیسماعیلییە

پێشەوا بەننا لە یاداشتەكانیدا دەفەرموێ : لە میصر و لە وڵاتانى ترى ئیسلامدا هەندێ ڕووداو گیان و ڕۆحیان دەسووتاندم و سۆزى دڵیان دەجۆشاندم، لەوە تێیان گەیاندم كە دەبێت چاكى لێ بكرێت بەلادا و دواى بێداربوونەوە ڕێگاى

پێکهێنـان بگیرێتـە پـێش و دوای لێکۆڵینـەوە کۆمـەڵێك بـۆ ئەنجامـدانی ئـەو کـارە پیرۆزە دامەزرێنرێت.

دەفەرموێ : قسەم لەگەڵ زۆرێك لە گەورە پیاواندا کرد، کە پێویستە ڕاپەڕین و ڕێگای کارو پێکهێنان بگرینە بەر، هەندێك خاویان دەکردمەوە و هەندێکیش هانیـان دەدام و هەندێ کەسیش پێیـان وتم: پەلـە مەکـە، بـەڵام کەسـێکم دەسـت نەکـەوت ڕێکخستن و بە کردارکردنی هەوڵەکانی لامەبەست بێت.

بۆیە ڕووم کردە هاوڕێیان و ئەو برایانەی کە لە کاتی خوێندندا خۆشەویسـتی و هەسـت کـردن بـە بەرپرسـیارێتی لـە نێوانمانـدا دروسـت بـوو بـوو، لەوانـەوە ئامادەگیەکی باشم بینی، لەگەڵیان پەیمانماندا کە هەریەکەمان بۆ ئەو مەبەستە کار بکەین، تاکو ئاراستەی ئوممەت بەرەو ئاراستەیەکی ئیسلامی چاك و پاك ببەین.

بۆیە لە (ئیسماعیلییە) وە یەکەمین ناوکی پێکهێنانی ئـەم بیرۆکەیـە دامـەزراو، یەکەم دەستەی بچووکی ئەم کارە هاتە بوون، و پەیمانی گوێڕایـەڵی لێبڕاوانـەی لـە ژێر ناوی (برایانی موسوڵمان) دا بە خوادا.

ئەوەش لە مانگی (ذوالقعدة) ی سـاڵی (١٣٤٧) ی کۆچـی بەرامبـەر بـە ئـاداری ساڵی (١٩٢٨) زاییندا بوو [1] .




دروشمی ئیخوان موسلیمین

---

(١) (قائد الدعوة لأنور الجندي / ص ١٣٧) .



مەرکەزی گشتی ئیخوان لە حیلمیە



مەرکەزی گشتی ئیخوان لە تەوفیقییە



یەکەمین مزگەوتی ئیخوان



گۆڤاری فە تحی ئیسلامی

**٩) دانراوو نووسینەکانی :**

١. مجموعة الرسائل لإمام البنا (حوالي عشرين رسالة) .

٢. مذكرات الدعوة والداعية.

٣. رسالة العقائد.

٤. السلام في الإسلام.

٥. مباحث في علوم الحديث.

٦. تربية النشء.

٧. المناجاة.

٨. المرأة في الإسلام.

٩. بعض فتاوى الإمام البنا.

١٠. تحديد النسل.

١١. قضيتنا.

١٢. مقالات مجلة المنار (نشرها الأخ الفاضل طارق منصور في الملتقى) .

١٣. بعض مقالات للإمام البنا (٤٧ مقالاً) .

١٤. المأثورات.

**١٠) مێژووی شەهیدبوونی :**

لە بەرواری : (١٢/ ١٠ / ١٩٤٩) ی زایینی بەرامبەر (١٤) ی ڕەبیعی دووەمی ساڵی (١٣٦٨) کۆچی دا لە تەمەنی (٤٩) ساڵیدا لە شاری (قاهیرە) شەهید کرا.

**بە پێویستم زانی کە وردەکاری شەهیدکردنی پێشەوا بەننا وەك خۆی کە لە دەمی (عبدالکریم منصور) ی زاوایەوە گێڕدراوەتەوە و شاهید عەیان بووە بنووسم کە ئەویش بەم جۆرە بوو[1] :**



عبدالکریم منصور

پێشتر پێشەوا بەننا بۆ بەردانی براکانی و بەشێ لە سەرکردەکانی برایان لە زیندان داوای لە سەرۆك وەزیران کردبوو کە بۆ بەردانی براکانی و دامرکاندنەوەی حکومەت لە بەرامبەر ڕەوتی برایاندا هەموو جۆرە قوربانیەك بە خۆی بدات کە بریتی بوو لە سێ پێشنیار کە حکومەت خۆی سەرپشك بێت کامیان هەڵدەبژێرێ بۆی ئەم قبوڵیەتی کە ئەویش ئەمانە بوو :

یەکەم : بەردانی سەرکردەکانی برایان و ئیش کردنی برایان بەپێی ئەو تەوجیهەی کە حکومەت بۆیان دادەنێ تا حکومەت دڵنیا بێت کە برایان هیچ نییەتێکی خراپیان لە پشتەوە نیە دژ بە حکومەت.

---

(١) لە سایتی (التحریر) و (www.ikhwan.net) وەرگیراوە.

دووەم : یاخود دوور بخرێتەوە بۆ گوندێکی دوورە دەست.

سێیەم : یان بنێردرێتە دەرەوەی وڵات ئیتر ئەو وڵاتە هەر دەوڵەتێکی عەرەبی یا ئیسلامی بێت.

بەڵام دیارە حکومەت بەم پێشنیارانەی پێشەوا بەننا ڕازی نەبوو ، هەر بۆیە حکومەت بە هیچ شێوەیەك وەڵامی هیچ کام لەو هەڵبژاردنانەی پێشەوا بەننای نەدایەوە و پشتگوێی خست.

**ئەو هەنگاوانەی کە حکومەت گرتیە بەر بۆ شەهیدکردنی پێشەوا بەننا:**

جا بۆیە حکومەت لە سەرەتای تیرۆرکردنی پێشەوا بەنناوە چەند هەنگاوێکی نا تا هیچ لایەك گومان نەخەنە سەر حکومەت و دام و دەزگاکانی، هەر بۆیە بۆ ئەو مەبەستە ئەم هەنگاوە بە پەلانەی نا :

١- دەستگیرکردنی زۆربەی سەرکردەکانی برایان جگە لە پێشەوا بەننا.

٢- لێ سەندنەوەی دەمانچە مۆڵەت دراوەکەی کە تایبەت بوو بە خۆی [1] .

---

(١) لێرەدا جێگەی خۆیەتی کە ئەو قسانەی (سەنا) ی کچی بگێڕینەوە کە نەنکی (واتە خەسووی حەسەن بەننا) بە پێشەوا بەننای وتووە بە چەند ڕۆژێ پێش شەهیدکردنی، پێی دەڵێ : کورە ئەی شێخ حەسەن! جوولەکەکان دەتکوژن ( دەبێ زۆر وریای خۆتبی) . پێشەوا بەنناش بە زەردەخەنەوە و پێکەنینەوە، هەروەك ئەوەی جەخت لە ڕاستێتی قسەکەی نەنکم بکاتەوە پێی وت: هەموو حکومەت بەو پەڕی تواناکانیانەوە لە هەوڵی پیلانگێڕیدان بۆ کوشتنی من ، سەرەڕای ئەوەی کە من بە تەنها هاموشۆ دەکەم و دەسوڕێمەوە و، خۆ منداڵێکی تەمەن دە ساڵانیش دەتوانێ من بکوژێت!
جا کاتێ (وەفا) ی کچی دەمانچەکەی خستە دەستیەوە بۆ ئەوەی بیبا لەگەڵ خۆیدا و پێی بێ، پێی وت: ئایا کچم تۆ پێت وایە ئەگەر کەسێ نیازی کوشتنی منی هەبێ منیش دەست بەجێ دەست بۆ دەمانچەکەم ڕادەکێشم و دەیکوژم ؟! {لە سایتی (أرض مصر) وەرگیراوە} .

٣- بڕینی هێڵی تەلەفۆنیماڵەوەیان.

٤- دەست بەسەراگرتنی ئەو ئۆتۆمبیلەی کە تایبەت بوو بە گواستنەوەی پێشەوا بەننا (کە موڵکی تایبەتی زاواکەی[1] بوو) .

٥- بانگ کردنەوەی ئەو پاسەوانەی کە ڕاتبی تایبەتی هەبوو لەلایەن حکومەتەوە بۆ پاسەوانی کردنی ماڵی پێشەوا بەننا (لە کاتێکدا کە هەموو سەرکردە دیارەکان پاسەوانی تایبەتی خۆیانیان هەبوو لە ماڵەوە) .

٦- دەستگیرکردنی پاسەوانە تایبەتەکەی کە (عبدالباسط بەننا) ی برای بوو.

٧- دەستگیر کردنی هەموو ئەوانەی کە سەردانی ماڵەوەی پێشەوا بەننایان کردبێت، ئەگەرچی چاویشیان پێی نەکەوتبێ.

٨- دەستگیر کردنی هەرکەسێ کە لە ڕێگاوباندا سەلامی لە پێشەوا بەننا کردبێ ئەگەرچی ئەوکەسە لە برایانیش نەبووبێ.

٩- قەدەغەکردنی پێشەوا بەننا لە چوونە دەرەوەی قاهیرە و سەفەرکردن بۆ هەر شوێنێکی تر.

١٠- ناردنی (محمد الناغي) کە یەکێ بوو لە کەسە نزیکەکانی سەرۆك وەزیر (ئیبراهیم عبدالهادی) ، وە ئەندامی (جمعية الشبان المسلمين) بوو تا داوا بکات لە (محمد الليثي) کە سەرۆکی (قسم الشباب) بوو لە (جمعية الشبان المسلمين) دا تا بە پێشەوا بەننا بڵێ : کە حکومەت دەیەوێ دانیشتنی لەگەڵدا بکەن و دانوستان لە نێوانیاندا دەست پێ بکاتەوە.

---

(١) مەبەست لە (عبدالحكيم عابدين) ە.



جمعية الشبان المسلمين



ئیبراهیم عبدالهادی سەرۆك وەزیر

جا لێرە بەدواوە قسەکان لە (عبدالکریم) ی زاوای دەبیستین کە شاهیدی ئەو ڕووداوە دڵتەزێنە بووە و لەگەڵیدا برینداربووە :

(عبدالکریم) دەڵێ : ئەو ڕۆژەی کە پێشەوا بەننای تێدا شەهیدکرا پێش ئەوە پێشەوا بەننا داوای لێ کردم کە بچم لە تەلەفۆنی دەرەوە پەیوەندی بکەم بە شێخ (عبدالله النبراوي) لە (بنها) تا داوای لێ بکەم کە پێشەوا بەننا دەیەوێ بچێتە لای ئەو لەوێ نیشتەجێ ببێ و پێکەوە بن، جا کاتێ تەلەفۆنەکەم کرد خێزانەکەی وەڵامیان دایەوە و وتی : بە پێشەوا بەننا بڵێ با نەیەت بۆ ئێرە چونکە پۆلیس زۆریان لێ داوین و شتومەك و ئەساسی ماڵەکەیان هەموو تێك و پێك داوە و شێخ (عبدالله) شیان دەستگیر کردووە.

جـا كاتـێ گەڕامـەوە بـۆ لای پێشـەوا بـەننا و هەواڵەکـەم پـێ ڕاگەیانـد، وتـی: مامۆستا (محمـد الليثـي) سـەرۆکی بەشـی گـەنجان لـە (جمعيـة الشـبان المسـلمين) هاتووە بۆلام و پێـی ڕاگەیانـدم : کـە حکومـەت دەیـەوێ چاویان بـە مـن بکـەوێ و دانیشتن و دانوستانەکان دەست پێ بکاتەوە، هەر بۆیـە منـیش ڕازی بـووم بـەوەی کە چاوم پێیان بکەوێ و دانوستانەکان دەست پـێ بکاتـەوە، بـۆ ئـەو مەبەسـتەش بارەگای (جمعية الشبان المسلمين) یان دیـاری کـردووە بـۆ ئـەو کۆبوونەوەیـە. جـا منیش بە پێشەوا بەننام وت : کە نابێ بچی بۆ ئەو کۆبوونەوەیە، چونکە حکومـەت شێخ (عبدالله النبراوي) یان دەستگیرکردووە و، نیازیـان خراپـە و دەیانـەوێت تـۆش دەستگیر بکەن ، بەڵام پێشەوا بەننا (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) بە گوێی نەکردم و بە قسەکانم ڕازی نەبوو، وە وتی : تازە من بەڵێنم داوە و بـۆ منـیش دروسـت نیـە کـە پێچەوانەی بەڵێنەکەم بکەم.

پاشـان (عبـدالكريم) دەڵـێ : مـن و پێشـەوا بـەننا لـە ئێـوارەی ڕۆژی شـەممە بەرواری (١١ / ١٠ / ١٩٤٩ م) چووین بۆ بارەگای (جمعية الشبان المسلمين) و لەوێ چاوەڕێی وەفدی حکومەت بووین ، بەڵام کەس دیارنەبوو تا بـوو بـە کـاتی عیشـا و بانگ دراو پێشەوا بەنناش نوێژی عیشای بۆ کردین و، لـە پاشـا نـا ئومێـدبووین کـە وەفدەکە نایەن، ئیتر پێشـەوا بـەننا داوای لـە (محمـد الليثـي) کـرد کـە تاکسـیەکی کرێمان بۆ بگرێ تا پێی بچینەوە بۆ ماڵ.

**کاتی تیرۆرکردنی پێشەوا بەننا :**

(عبدالكريم) دەڵێ : لە پاشا من و پێشەوا بەننا و (محمد الليثي) کە بـۆ بـەڕێ کردنی پێشەوا بەننا یاوەری دەکردین چووینە خوارەوە، ئەم ڕووداوە دڵتەزێنـە کـە ڕووی دا لە شەقامی (الملكة نازلي) بوو، لە هەمووی سەیرتر ئەوە بوو کە جگـە لـەو تاکسیە هیچ تاکسیەکی تر لە گۆڕەپانەکەدا نەبوو تەنها یەك ئۆتۆمبیلی ڕەش نەبێ

کە لەوبەری شەقامەکە ڕاوەستا بوو، هەر چەند (عبدالکریم) دەڵێ : سەرنجی پێشەوا بەننام ڕاکێشا بۆلای سەیارە ڕەشەکە کەوا چاودێریمان دەکەن، بەڵام پێشەوا بەننا بە زەردەخەنەیەکەوە تێی گەیاندم کە هیچ نیە و گوێی مەدەرێ، لە پاشا کەسێ کە (ئیبراهیم) ی ناوبوو لە بارەگای (جمعیة) دابەزی و هات بە (محمد اللیثي) وت : کە تەلەفۆن داوات دەکات. ئەویش دوای خواحافیزی لێمان سەرکەوت چووەوە بۆ شوێنی خۆی لە بینای (جمعیة) .

پاشان پێشەوا بەننا چووە دواوەی تاکسیەکە و لای ڕاست دانیشت و منیش چوومە لای چەپیەوە، بەڵام تاکسیەکە یەکسەر دەستی نەکرد بە ڕۆیشتن بەڵکو وردە وردە و لەسەرخۆ دەستی کرد بە ڕۆیشتن، تا نزیکەی پێنج (مەتر) ێك ڕۆیشت، ئیتر لە پڕا دوو کەس دەرکەوتن کە بە پیادەیی دەڕۆیشتن دەمانچەکانیان دەرکرد و یەکێ بۆ لای من و ئەوی تریش بۆلای پێشەوا بەننا ، ئەوەی دەمانچەکەی ڕووی کردبووە پێشەوا بەننا نزیکەی حەوت گوللەی پێوە نا، و وە ئەوەی تریش یەك دوو فیشەکی نا بەسەر سنگی منەوە، ئیتر خێرا پێشەوا بەننا لە تاکسیەکە دابەزی و ئەوانیش بە هەڵەداوان ڕایان کرد بەرەو بارەگای (نقابة المحامین) کە ئۆتۆمبیلە ڕەشەکەی لەبەردەم وەستابوو ، نزیکەی (١٠٠) مەترێ پێشەوا بەننا هەر بە دوایانەوە بوو ، بەڵام دواتر لە دووری یەك مەتر یەك فیشەکی تریشیان بە پێشەوا بەنناوە نا، ئیتر خێرا خۆیان گەیاندە ناو ئۆتۆمبیلە ڕەشەکە و بۆی دەرچوون ، ئیتر دوای ئەوەی کە هەردوو تاوانبارەکە ڕادەکەن پێشەوا بەننا بە برینداریەوە دێتەوە من هەڵدەگرێ و دەمخاتەوە ناو تاکسیەکە، لەو کاتەشدا شۆفێرەکە بە حیساب لە هۆش خۆی چوو بوو، جا کاتێ دێتەوە هۆش خۆی پێشەوا بەننا دەینێرێ بۆ هێنانی ئیسعاف بۆ من، کاتێکیش ئیسعاف دەگاتە جێ

پێشەوا بەننا بە دکتۆرەکە دەڵێ : خەریکی من مەبن بەڵکو بچن بەلای مامۆستا (عبدالکریم) ە وە چونکە ئەو برینداریيەکەی سەخت ترە و پێویستی بە چارەسەرە.



لە پاش بیستنی تەقەکان (محمد اللیثي) دێتە خوارەوە بۆلامان و پێشەوا بەنناش پێی دەڵێ : ئەمە ژمارەی ئەو ئۆتۆمبیلەیە کە تاوانبارەکانی پێ دەربازبوون، کە بریتی یە لە (٩٩٧٩) .

جا دوای چارەسەرێکی بە پەلە پێشەوا بەننا داوا دەکات کە زوو من بگەیەننە نەخۆشخانەی (القصر العینی) و سووریش دەبێ لەسەر ئەوەی کە بێت لەگەڵما بۆ نەخۆشخانە، هەرچەند پێکرانەکەی پێشەوا بەننا بەو جۆرە نەبووە کە بیکوژێ ، لە پاش گەیشتنمان بۆ نەخۆشخانەکە و چاوەڕوان کردنی دکتۆرەکە بۆ ماوەیە، لەو کاتەدا ئەمیرالای (محمد وصفی) هاتە ژوورەوە بۆ لامان و بە دەنگێکی بەرز پێی

وتـین : (أنـتم لسـه مـا متـوش یـا مجـرمین) واتـه: ئـەی تاوانبـاران ئـەوە هێشـتا نەمردوون.



لەپاشا پەیوەندییان کرد بە ماڵی دکتۆری ئێشکگر کە لە (روکسي) لـە (مصـر الجدیدة) بوو، ئیتر ئەویش بە پەلە بە ئۆتۆمبیلەکەی دێت بۆ نەخۆشخانە، جا کاتـێ گەیشتە لامان پێشەوا بەننا پێی وت : بچۆ خەریکی مامۆستا (عبدالکریم) بە چونکە ئەو حاڵەتی باش نیە و پێویستی بە چارەسەرە. دواتر دکتۆرەکە فـەرمانی کـرد بـە یەکێ لـە پەرسـتارەکان کـە کراسـەکە لەبـەری پێشـەوا بـەننا دابکـەنێ بـۆ ئـەوەی تەداوی بکات، بەڵام پێشەوا بەننا نەیهێشت بـۆی داکـەنێ بـەڵکو خـۆی کراسـەکەی داکەند ، جا کاتێ ویستیان ناوو ناونیشانم لێ وەربگـرن پێشـەوا بـەننا وتـی: واز لـە مامۆسـتا (عبـدالکریم) بهێـنن چـونکە ئـەو حاڵـەتی بـاش نیـە، وەرن مـن نـاوو ناونیشانتان پێ دەدەم.

دیسان بۆ جاری دووەم ئەمیرالای (محمد وصـفی) هاتـە ژوورەوە بۆلامـان و بـە دکتۆرەکەی وت: من لەلایەن حوکمدارەوە هاتووم تا بـزانین شێخ (حەسـەن بـەننا) حـاڵ و وەزعـی برینداریەکـەی چـۆنە؟ دکتۆرەکـەش پێـی وت: حاڵەتەکـەی زۆر مەترسیدار نیە.

ئیتر لە دوای ئەوە من و پێشەوا بەننایان لە یەکتر جیاکردەوە و ئـەویان کـردە ژوورێکی تەنیاوە و منیشیان کردە لای نەخۆشێکی تر.




لەپاشا بۆم دەرکەوت کە ئەمیرالای (محمد وصفی) نوێنەری مەلیك (فاروق) ە و هاتووە تا ژیانی پێشەوا بەننا بخاتە مەترسیەوە.

جا بەهۆی نەهاتنی دکتۆر بە دەمیەوە و زۆر لێ ڕۆیشتنی خوێن و نەدوورینەوەی شوێنی پێکرانەکەی ئەوە دەبێتە هۆی شەهیدبوونی و لە ژیان دەرچوونی.



**مەلیک فاروق**

**تەسلیم کردنەوەی تەرمی پێشەوا بەننا بە کەس و کارەکەی:**

ئەو شەوەی کە پێشەوا بەنناى تێدا شەهیدکرا پەیوەندیەکی تەلەفۆنی لەلایەن بەڕێوەبەرایەتی پۆلیسەوە کرا بۆ ماڵی باوکی پێشەوا بەننا کە پێشەوا بەنناى کوڕی وەفاتی کردووە، وە پێیان وتبوو: کە پاش کەمێکی تر تەرمەکەی دەهێنینەوە بۆ ماڵەوە، لەبەر ئەوە نابێ هات و هاوار بکەیت و کەس ئاگادار بکەیتەوە بۆ ئەوەی نەبێتە هۆی کێشە و هەراو ئاژاوە نانەوە، ئەگەر وا نەکەیت تەرمەکەت پێ نادەینەوە.

لە پاش ماوەيەك لە يەك و دووی شەوا تەرمی پێشەوا بەنتايان هێنايەوە بۆ ماڵی باوكی و تەنها باوكی و (مكرم عبيد باشا) لە پێشوازی تەرمەكەدا بوون ، چونكە چواردەوری ماڵەكەيان بە پۆليس تەنی بوو كەس نەی دەوێرا لە دراوسێكان بێن بۆ پێشوازی لە تەرمەكە و شۆردن و كفن كردنی، هەر بۆيە باوكی دڵ سووتاو بە دەم گريان و فرمێسك هەڵڕشتنەوە بە تەنيا دەستی كرد بە شۆردنی لاشەی كوڕە شەهيدەكەی و كفنی كرد. لەپاشا خۆی و (مكرم عبيد باشا) و سێ ئافرەتی تر جەنازەكەيان بە شان هەڵگرت و برديان بۆ مزگەوتی (قيسون) تا لەوێ نوێژی مردووی لەسەر بكەن، پاشان لەگەڵ كارگوزارانی مزگەوت نوێژيان لەسەركرد و دواتر جەنازەكەيان هەڵگرت و برديان بۆ گۆڕستانی (ئيمام شافيعی) و لەوێ ناشتيان.





مكرم عبيد باشا

(عبدالكريم) دەڵێ : سەير لەوەدايە من هێشتا لە نەخۆشخانە بووم و لە ژێر چاودێری دكتۆردا بووم ، لە دوای چەند ڕۆژێ لە شەهيدكردنی پێشەوا بەنتا ڕۆژنامەی (الأساس النقراشية) ڕای گەياندبوو كە من مردووم، كە لە بڵاوكردنەوەی هەواڵەكەدا نووسی بووی (وفاة المصاب الثاني) .

جا كاتێ نوێنەری ڕۆژنامەكە هاتبوو كە لە كوێ دەنێژرێ ، ئيدارەی نەخۆشخانەكە پێيان ڕاگەياندبوو كە من زيندووم و بۆ ماوەی چەند مانگێك لە ژێر چاودێری دكتۆردا دەمێنێتەوە تا عيلاج وەربگرێ.

**ئەو شەوەی کە بۆ بەیانی بەننا شەهید دەکرێ:**

پێشەوا بەننا بۆ هاوسەرەکەی دەگێڕێتەوە و دەڵێ : ئەمشەو لە خەومدا بە خزمەتی ئیمامی (عەلی) گەیشتم و لە خەوما فەرمووی پێم : کە کارەکەت ئەنجامداوە و پەیامەکەت گەیاندووە خوا لێت قبوڵ بکات.

لەپاشا بە خێزانی دەڵێ : دیتنی ئیمامی (عەلی) مژدەی شەهادەتە.

**پرسەنامەیەك لەلایەن شێخ (أحمد عبد الرحمن البنا ) ی**

**باوکی پێشەوا بەنناوە**

ولدي الشهيد ...

رحم الله الرجل القرآني ، والداعية الكبير، والمثقف الإسلامي ، والمجاهد العظيم الذي جاهد ضد الطغيان ، إنه الأستاذ الشيخ المرشد حسن البنا رحمه الله رحمة واسعة ، وإنني والله أحزن لأنني لم أستطع في هذا الرد أن أوفي هذا الضيغم الغضنفر حقه ، اللهم أكرم نزله، وأعلي مرتبته، واجعل الجنة مثواه ومستقره، اللهم لا تحرمنا أجره ولا تفتِنّا بعده، واغفر لنا وله.

**١١) ئەو دە وەسێتەی کە (پێشەوا بەننا) بۆ برایان و دۆستانی کردبوو:**

**یەکەم** : (قم إلى الصلاة متى سمعت النداء مهما تكن الظروف).

**دووەم** : (اتل القرآن أو طالع أو استمع أو ذكرالله ولا تصرف جزءا من وقتك في غير فائدة).

**سـێیە** : (اجتهد أن تتكلم العربية الفصحى فإن ذلك من شعار الإسلام).

**چوارەم** : (لا تكثر الجدل في أي شأن من الشؤون أيا كان فإن المراء لا يأت بخير).

**پێنجەم** : (لا تكثر الضحك فإن القلب الموصول بالله ساكن وقور).

**شەشەم** : (لا تمزح فإن الأمة المجاهدة لا تعرف إلا الجد).

**حەوتەم** : (لا ترفع صوتك أكثر مما يحتاج إليه السامع فإنه رعونة وإيذاء).

**هەشتەم** : (تجنب غيبة الأشخاص وتجريح الهيئات ولا تتكلم إلا بالخير).

**نۆیـەم** : (تعرف إلى من تلقاه من إخوانك وإن لم يطلب إليك ذلك فإن أساس دعوتنا الحب والتعارف).

**دەیـەم** : (الواجبات أكثر من الأوقات فعاون غيرك على الإنتفاع بوقته وإن كان لك مهمة فأوجز في قضائها).

**١٢) ئەو کتێبانەی کە لەسەر (پێشەوا بەننا) نووسراون:**

**١ - الرجل القرآني حسن البنا - روبير جاكسون.**

**٢ - الفقه السياسي عند الإمام البنا - أبو فارس.**

**٣ - شخصية حسن البنا كما يراها الناس - لبيب البوهي.**

**٤ - معالم المشروع الحضاري عند الإمام البنا - محمد عمارة.**

**٥ - حسن البنا - عبد المجيد الباجوري.**

**٦ - الإمام -احمد أنس.**

٧ - جهود الإمام البنا في إصلاح الريف المصري - علاء ممدوح.

٨ - الإمام البنا في المئوية الأولى لمولده - رجب البنا.

٩ - رسائل حسن البنا إلى أبيه - جمال البنا.

١٠ - لماذا اغتيل حسن البنا- عبد المتعال الجبري.

١١ - حسن البنا وثورة اليمن - حمادة حسني.

١٢ - مع الإمام الشهيد حسن البنا - محمود عساف.

١٣ - من قتل حسن البنا؟ محسن محمد.

١٤ - يا أيها العالم هذا هو حسن البنا.

١٥ - حسن البنا الرجل الأمة - أحمدي قاسم محمد.

١٦ - قضية الشهيد الإمام حسن البنا١ - فتحي عبد الحميد.

١٧ - نظرة إلى التراث الفكري والاجتماعي للشيخ حسن البنا - هادي خسروشاهي.

١٨ - البنا وتجربة الفن - عصام تليمة.

١٩ - حسن البنا والقضية الفلسطينية.

٢٠ - سطور من حياة الإمام المجدد "حسن البنا " - بدر محمد بدر.

٢١ - الإمام البنا والمشروع الإسلامي - جمال ماضي.

٢٢ - الأمل عند حسن البنا - جمال ماضي.

٢٣ - معالم الفكر التربوي لدى الإمام البنا - محمود أبو دف.

٢٤ - أكثر من عشرة أعوام ...أنعم بالقرب من الإمام البنا - حلمي عبد المجيد.

٢٥ - الإمام حسن البنا والقضية الفلسطينية - مُحسن صالح.

٢٦ - الحكومة في بناء البنا تنظيريا وعمليا - محمد علي عطا.

٢٧ - البنا والقضية الفلسطينية - طارق عبد الرحمن.

١٣) هەندێ لە وێنەکانی پێشەوا بەننا :



پێشەوا بەننا بەجل و بەرگی سەربازیەوە
لەکاتی جەنگ دژبە یەهوودیەکان



پێشەوا بەننا و سریەیەکی ئیخوان















پێشەوا بەننا لە چەند کۆڕێکی جیاوازدا



پێشەوا بەننا لە کاتی مەشقی سەربازی



پێشەوا بەننا لەگەڵ خۆشەویستانی



پێشەوا بەننا لەگەڵ ڕۆژنامەنووسێکی بیانی دا



مورشیدەکانی ئیخوان لە دوای پێشەوا بەننا

سەرچاوەکان:

١. ئیمام حەسەن بەننا / نووسینی (مصطفى محمد الطحان) وەرگێڕانی : ( محمد عبدالرحيم ) .

٢. أصول العشرين / نووسینی ( پێشەوا حەسەن بەننا ) .

٣. چەند پێگەیەکی ئینتەرنێت.

## پوختەیەك
## لە ژیاننامەی پێشەوا سەیید قوتب



١) ناوی تەواوی

٢) شوێنی لە دایك بوون و پەروەردەبوونی

٣) ناوی باوك و دایك و برا و خوشكەكانی

٤) قۆناغەكانی خوێندن و پلەی زانستی و لێهاتوویی

٥) توانای ئەدەبی و ڕۆشنبیری سەیید

٦) هاوسەرگرتنی سەیید قوتب

٧) چەند سیفاتێكی بەرزی سەیید لەگەڵ كەسانی چواردەوریدا

٨) هەوڵ و تێكۆشان و لێبڕان بۆ كاری ئیسلامی

٩) دانراوو نووسینەكانی

١٠) مێژووی شەهیدبوونی

١١) ئەو كتێبانەی كە لەسەر (سەیید قوتب) نووسراون

١٢) هەندێ لە وێنەكانی مامۆستای شەهید

سەرچاوەكانی ئەم ژیاننامەیە

# پوختەیەك
# لە ژیاننامەی پێشەوا سـیـد قـطـب



**وێنەی مامۆستای شەهید**

**١) ناوی تەواوی :**

(سەیید) کوڕی (قوطب) ی کوڕی (ئیبراهیم) ی کـوڕی (حوسـێن) ی شـازلییە، باپیرەی پێنجەمی لە هیندەوە هاتووە.

سەبارەت بـە ڕەچـەڵەکی (سـەیید) و بردنـەوەی بـۆ وڵاتـی (هینـد) هەنـدێ لـە نووسـەران و مێژوونوسـان، ئـەو مێـژوویان سـەلماندووە کـە (سـەیید) بـە ڕەگـەز (هیندیە) و لە وڵاتی هیندستانەوە باپیرە پێنجەمی بۆ وڵاتی میصر کۆچیان کردووە و لەوێ نیشتەجێ بوون.

**٢) شوێنی لە دایك بوون و پەروەردەبوونی :**

لە (٩ / ١٠ / ١٩٠٦) زایینەدا لە گوندی (موشا) ی سەر بە پارێزگای (ئەسیوط) کە دەکەوێتە باشووری وڵاتی میصرەوە هاتۆتە دنیاوە.



گوندی مووشا

**٣) ناوی باوك و دایك و برا و خوشکەکانی [1] :**

**أ- باوکی :** حاجی (قوطب) ی کوڕی (ئیبراهیم) ی کوڕی (حسێن) ی شازلییە و، سێ خوشك و یەك برای دایك و باوکی هەیە.

باوکی سەیید هەم دیندار و دەست و داوێن پاك و حەڵاڵ خۆر بووە و بە دەستەکانی خۆی ڕەنجی کێشاوە و منداڵەکانی خواردنی حەڵاڵی پێداون، هەم خوێندەوارێکی زرینگ و چالاك بووە و ڕۆژنامە و گۆڤارەکان لە ماڵی ئەوان دەخوێنرایەوە و لەوێوە باس و خواستەکانی ناو گۆڤار و ڕۆژنامەکان بۆ گوندەکەیان پەخش دەکرایەوە.

ئەمەکداری و میوان دۆستی حاجی قوتب باس و خواسی خەڵکی گوند و دەوروبەری گوند بووە و هەمیشە خەڵکی ئاوایی ڕێزێکی ئێجگار گەورەیان لە حاجی

(١) (طفل من القرية / ص ٣٨) .

قوتب دەگرت. لە باری سیاسیشەوە حاجی قوتب پەیوەندی بە پارتی نیشتیمانییەوە هەبووە و ئەندامی لیژنەی ئەو پارتە بووە لە گوندەکەیان و زۆرجار لە ماڵیان کۆبوونەوەی حیزبی کراوە.

**ب- دایکی** : دایکی سەییدیش هەم لە خێزانێکی خاوەن پلە و پایەی کۆمەڵایەتی و، هەم ژنێکی باوەڕدار و خواناس و لە خواترس بووە و هەمیشە لە ماڵەکەیاندا دەنگی زوڵاڵی قورئان گوێچکەی خەڵکی گوندەکەیانی دەهەژاند.

سەیید لە بارەی دایکیەوە لە یەکەم کتێبی ئیسلامی خۆی کە پێشکەش بە دایکی کردووە بەناوی (التصوير الفني في القرآن) دەفەرموێ : درێژەی دەخایاند کە لە گوندەکەدا و لە پشت پەنجەرەوە گوێت دەگرت بۆ قورئان خوێنەکان کە لە ماڵماندا بە درێژایی مانگی ڕەمەزان قورئانیان دەخوێند، منت لەگەڵدا بووم دەمویست وەك منداڵ یاری و گاڵەگاڵ بکەم، بەڵام لەلایەن تۆوە ئاماژەیەکی خێراو چرپاندنێکی بێدەنگکەر دەیگێڕامەوە و بێ دەنگ دەبووم و لەگەڵ تۆدا گوێم لە قورئان خوێندنەکە دەگرت، دەروونم مۆسیقای قورئان خوێندنەکەی دەچەشت ئەگەرچی تا ئەو کاتە لە واتاکەی نەدەگەیشتم: کاتێك لەبەر دەستەکانی تۆدا گەورەبووم منت ناردە قوتابخانەی سەرەتاییەوە لە گوندەکەدا، یەکەم ئاواتت ئەمە بوو خوای گەورە دەروازەی چاکەم لێ بکاتەوە قورئان لەبەر بکەم و دەنگێکی خۆشم پێ ببەخشێ تاکو هەموو کات قورئانت بۆ بخوێنم [1] .

دایکی سەیید چوار برای هەبووە و دوانیان لە ئەزهەر دەیان خوێند و خێزانەکەیان هەردوو بواری زانستی و ئاینیان پێکەوە گرێدا بوو. دایکی سەیید ژنی دووەمی باوکی سەیید بووە و یەکەمین مناڵ لە باوکی سەیید بووە. هەر بۆیە دایکی

---

(١) (طفل من القرية / ص ١٩٢) .

زۆر گرنگی داوە بە سەیید و بە دینداری و زانست پەروەری گۆشی کردووە.

خۆشەویستی دایکی بۆ (سەیید) جێگای تێڕامانی زۆر بووە و هەمیشە خوازیاری ئەوە بووە ئەم کوڕەی ببێتە نمونەی کەسێکی خوێندەوار و دیندار و ڕەوشت پاك... گەلێك جار هانی سەییدیداوە کە بەردەوامی بدات بە خوێندن و داخوازیشی لە براکانی ئەوە بووە لە ژێرچاودێری ئەواندا سەیید درێژە بە کاروانی زانست بدات هەتا دوا مەنزڵی خوێندن.

**ج- براکانی:** سەیید قوتب تەنها یەك برای هەیە ئەویش ناوی (محمد) ە ، بە (١٣) ساڵ دوای لە دایك بوونی سەیید لە نیسانی (١٩١٩ م) دا لەدایك بووە، (محمد قوتب) بەو چەشنەیە کە هەموو جیهان دەیناسێ ...

مامۆستای ڕاستەقینەی (محمد قوتب) سەییدی برای بوو، هەر بۆیە لە یەکەم دانراوی بە چاپ گەیانراوی خۆی پێشکەش بە سەییدی برای دەکا بەناوی (سخریات صغیرە) ، لە پێشکەش کردنەکەدا هاتووە: بۆ ئەو برایەم کە فێری کردم چۆن بخوێنمەوە و چۆن بنووسم، خستمیە ژێر چاودێری خۆیەوە لە منداڵیەوە. ئەو بۆ من باوك و براو هاوڕێ بوو، ئەم کتێبە پێشکەش بەو دەکەم بە ئومێدی ئەوەی توانیبێتم شتێك لەو قەرزە گەورەیە بدەمەوە [1] .




محمد قطب

(١) (مقدمة سخريات صغيرة لمحمد قطب/ ص ٥) .

**د- خوشکەکانی:** سەیید تەنها سێ خوشکی هەیە بەناوەکانی :

**یەکەم: نەفیسە**: سێ ساڵ لە سەیید گەورەتر بوو، مارەبڕا لە (بەکر شافع) ، نەفیسە چیرۆکێکی پڕ لە جیهاد و تێکۆشان و ئارامگرتنی هەیە. ئەوەبوو زیندانی کراو ئازارو ئەشکەنجە درا وەك هەردوو کوڕەکەی، یەکەمیان بەناوی (ڕەفعەت) کە قوتابی کۆلیژی ئەندازیاری بوو لە زانکۆی (قاهیرە) ، کە دوای ئەشکەنجەدانێکی زۆر لە زیندانی سەربازی گیانی سپاردو، نەفیسەش ئارامی گرت و خۆڕاگربوو.

هەروەها کوڕی دووەمی بەناوی (عەزمی) کە قوتابی کۆلیژی پزیشکی بوو لەو کاتەدا دەستگیرکراو هێندە ئەشکەنجە درا نزیك بوو ئەویش لە بەندیخانەدا گیان لەدەست بدات.

**دووەم: ئەمینە** : ئەمینە گرنگی بەلایەنی ئەدەبی دەداو هاوبەشی هەبوو لە کاری ئەدەبیدا ، بە چەند کورتە چیرۆکێکی خۆی بەشداری براکانی کرد لە کتێبە هاوبەشەکەیاندا (الأطياف الأربعة) .

ئەمینە مارەبڕا لە یەکێك لە زیندانییەکان لە ساڵی (١٩٥٤ م) کە ناوی (محمد کەمال ئەلسەنانیری) بوو، جا لە دوای ئەوەی کەمال سەنانیری لە سەرەتای حەفتاکاندا و لە ساڵی (١٩٧٣ م) لە زیندان هاتەدەرەوە ئەمینەی گواستەوە، بەڵام لە پاشان دەستگیر دەکرێتەوە و بەهۆی ئازارو ئەشکەنجەدانێکی زۆرەوە لە زیندان لە بەرواری (٨ / ١٠ / ١٩٨١ م) گیانی سپارد و گەڕایەوە بۆلای خوای خۆی.



ئەمینەخانی خوشکی سەیید قوتب



وێنەی ئەمینە و زەینەب غەزالی




محمد کەمال ئەلسەنانیری

سێیەم: حەمیدە : ئەدەب لای حەمیدە جێگەی گرنگی پێدان بوو، ئەو بیرانەی کە بە بیروهۆشیدا دەهاتن دەینووسین، هەروەها بەشداری براکانی دەکرد لە گۆڤاری (المسلمون) و (الإخوان المسلمون) و، لە جگە لەمانەشدا بابەتی بڵاودەکردەوە.




دکتۆر حەمدی مەسعود    حەمیدە خانی خوشکی سەیید

لە دوای کارەساتەکەی برایانی ساڵی (١٩٥٤ م) لەگەڵ دەستەیەك لە خوشکانی موسوڵمانی تێکۆشەردا هەستان بە چاودێری کردنی خێزان و ماڵ و منداڵی برا زیندانییەکان.

حەمیدە دوای دەستگیرکردنی و دادگایی کردنی لەلایەن دادوەری سەربازی (محمد فوئاد) ە وە بۆ ماوەی (١٠) ساڵ لەگەڵ ئیشی قورسدا، شەش ساڵ وچوار

مانگی لە زینداندا بردە سەر لە نێوان زیندانی جەنگی و زیندانی (ئەلقـەناتر) [1] دا ، لە کۆتاییدا لە سەرەتای حەفتاکاندا لە زیندان ئازادکراو دکتـۆر (حەمـدی مەسـعود) مارەی کردو لەگەڵ هاوسەرەکەی لە (فەرەنسا) نیشتەجێ بوون.

لە ڕۆژی جومعە لە بەرواری (١٣ / ٧ / ٢٠١٢ م) لـە وڵاتـی غـەریبی (فەرەنسـا) (حەمیدەخان) لە تەمەنی (٧٥) ساڵیدا کۆچی دوایی کرد و گەیشتەوە بـە خزمـەتی خوای موتەعال.

## ٤) قۆناغەکانی خوێندن و پلەی زانستی و لێهاتوویی :

سەیید لە گوندەکەی خۆیان و لە ژێر چاودێری دایك و باوکیدا لە سـاڵی (١٩١٢ م) دەخرێتـە خوێنـدنگای سـەرەتایی و هـەر لـەوێ لـە سـاڵی (١٩١٨ م) دا خوێنـدنی سەرەتایی تەواو دەکا و دەبێتە هەڵگری بڕوانامەی سورەتایی.

پێ بە پێی هەڵکشانی تەمەنی و پـاش تـەواو کردنـی قۆنـاغی سـەرەتایی و بـە مەبەستی تەواو کردنی قۆناغەکانی دیکـەی خوێنـدن و لـە سـەر ڕاسـپاردەی دایکـی ساڵی (١٩٢٠ م) گوندی (مووشا) جێ دەهێڵێ و ڕوو لـە قـاهیرە دەکـات و لـەوێ لـە گەڕەکێك لە گەڕەکـەکانی قـاهیرەدا کـە نـاوی (زەیتـون) ە لـەلای خـاڵ (ئەحمـەد حسەین) نیشتەجێ دەبێت.

بەڵام بە هۆی شۆڕشی (١٩٢٠ م) ە وە دوو ساڵ لە قوتابخانە دادەبڕێت، وە لە ساڵی (١٩٢٢ م) پەیوەندی دەکات بـە خوێنـدنگای مامۆسـتایانی سـەرەتاییەوە لـە (قاهیرە) ، کە ناوی خوێندنگای (عبدالعزیز) بوو، سێ ساڵی خوێندنی تێدا تەواوکرد و بوویە هەڵگری مۆڵەتی (الکفاءة) بۆ خوێندنی سەرەتایی و، بە هۆی لێهاتوویـیـەوە لە خوێندندا لە ساڵی (١٩٢٥ م) پەیوەندی بە خوێندنگای دواناوەندییەوە کـرد، کـە

---

(١) (مذابح الإخوان في سجون ناصر ــ جابر الرزق / ص ١١٥) .

بریتـــی بـــوو لـــە (تجهیزیـــة دار العلـــوم) ، لـــەم خوێندنگایـــەدا تـــەنها خوێنـــدکارە لێهاتووەکان وەردەگیران، ئەم خوێندنگایە خوێندکاری ئامادە دەکرد بۆ ئەوەی لـە کۆلیژی (دار العلوم) وەربگیرێن.



خوێندنگای عبدالعزیز جاویش

دوای ئەوەی قۆناغی ئامادەیی بە سەر کەوتوویی تەواو دەکات لە ساڵی (١٩٢٩ م) لـە (دار العلـوم) بەشـی پێگەیانـدنی مامۆسـتایان وەردەگیرێـت و ئـەو قۆناغـەی دیکەی خوێندنیش سەر کەوتوانە تەواو دەکات. پاش چوار ساڵ و لە ساڵی (١٩٣٣) بڕوانامـەی (لیسـانس) یـاخود (الإجـازة العالیـة) لـە ئـەدەب و زمـانی عەرەبیـدا وەردەگرێت.



دار العلوم لە قاهیرە

دوا بە دوای وەرگرتنی بڕوانامەی (لیسانس) سەیید لە بەرواری: (٢ / ١٢ / ١٩٣٣ م) لە وەزارەتی (مەعاریف) بە مامۆستا دامەزێنرا، و پاشان دەبێتە مامۆستا لە (دمیاط) و یەکەم مووچەش کە وەریگرت شەش (جونەیە) بوو.

دواتر لە ساڵی (١٩٣٥ م) وەزارەتی مەعاریف سەییدی گواستەوە بۆ خوێندنگای (بەنی سیوف) وەك مامۆستا جێگیر دەبێت و هەر لەوێش خانویەکی خنجیلانە بە کرێ دەگرێت ، ئیتر هەموو ژیانی لەگەڵ کەس و کارەکەیدا لەو خانووەدا بردەسەر.

(حەسەن حەنەفی) کە یەکێك لەو کەسانەیە خۆی بە ژیانی سەییدەوە سەرقاڵکردووە، ژیانی سەیید بەسەر چوار قۆناغدا دابەش دەکات...!.

١) قۆناغی ئەدەبی... ئەم قۆناغە (٢٠) ساڵ تەمەنی سەیید دەبات، ساڵی (١٩٣٠ - ١٩٥٠ م) .

٢) قۆناغی کۆمەڵایەتی... ساڵی (١٩٥١ - ١٩٥٤ م) .

٣) قۆناغی فەلسەفە... ساڵی (١٩٥٤ - ١٩٦٢ م) .

٤) قۆناغی سیاسی... ساڵی (١٩٦٢ - ١٩٦٦ م) .





سەیید قوتب لەو کاتانەی کەلە گەشتی ئەمریکا بوو

**٥) توانای ئەدەبی و ڕۆشنبیری سەیید :**

ساڵی (١٩٢٣ م) ئەو دەمەی سەیید قوتابی قۆناغی سێیەمی کۆلێژ دەبێت بابەتێکی ڕەخنەیی بە ناوی (مهمة شاعر في الحياة، و شعر الجيل الحاضر) وەك موحازەرەیەك لە کۆلێژ پێشکەش دەکات. موحازەرەیەکی هێندە کاریگەر دەبێت کە نەك هەر خوێندکاران پێی سەرسام دەبن. بەڵکو مامۆستاکەی (محەممەد مەهدی عەللام) سەر سوڕمانی خۆی لە ئاست توانستی قوڵ و زیرەکی و توانای ئەدائی سەرکەوتوانەی سەیید دەردەبڕێت و لە بارەیەوە دێتە ئاخاوتن و دەڵێ: (ئەگەر چی من سەییدم وەك قوتابی پێشکەش کرد، شادومان دەبم کە یەکێك لە قوتابییەکانم، من ئەمڕۆ دەڵێم – کاتێك گوێم لە بابەتەکەی گرت – ئەگەر جگە لە سەیید هیچ قوتابییەکی ترم نەبێت بەسمە بۆ ئەوەی دڵخۆشم بکات و متمانەم پێ ببەخشێ، دڵنیام بۆ ئەوەی ئەمانەتی زانست و ئەدەب هەڵبگرم لە کەسێکدا کە گومانم لە هەستانی نییە بەوکارەی – من (سەیید قوتب) دادەنێم بە شانازییەك لە شانازییەکانی (دار العلوم) کاتێك وتم دار العلوم ئەوە مەبەستم (دار الحكمة والادب) ە[(١)].



محمد مەهدی عەللام



سەیید قوتب

(١) (سەیید قوطب لە هاتنە دنیاوە تا شەهید بوون ـ د.صلاح عبدالفتاح الخالیدی و طارق نجیب / ص ٤٨) .

سەیید بە گەیشتنی بۆ (قاهیرە) و لە تەمەنی (١٦)ساڵیدا دەستی بە نووسین کرد لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکاندا، خاڵیشی کە ڕۆژنامە نووس بوو لە پاڵ کاری ڕۆژنامە گەری خۆیدا هانی سەییدی دەدا و ڕێنمایی دەکرد کە لە سەر کارێکی مەدروس و ڕیتمێکی سەرکەوتوو بەردەوامی بە پیشەی ڕۆژنامەگەری بدات. یەکەم بابەت کە سەییدی لاو لە بواری ڕۆژنامەگەریدا نووسی لە ڕۆژنامەی (البلاغ) ساڵی (١٩٢٢ م) بڵاوکرایەوە.

پاشان سەیید بەردەوامێتی بە کاری نووسین و ڕۆژنامە گەریدا، لە ڕۆژنامەکانی (الأهرام، الاسبوع، الحیاة الجدیدة، کوکب الشرق، الوادي، المصور، الدعوة، الرسالة، الثقافة) و گۆڤارەکانی وەك (الاخوان المسلمون، الفكر الجدید، العالم العربي، البلاغ، الجهاد، المقتطف) . بەبابەتی بە پێز نووسراوەکانی بڵاودەکردەوە.

### ٦) هاوسەرگرتنی سەیید قوتب:

سەیید هاوسەری ژیانی دەست نیشان کردو مارەی بڕی ، بەڵام بەهۆی ئەوەی کە پێشتر ئەو ئافرەتە کەسێکی تر لە ژیانیدا بوو دەست بەرداری یەکتری بوون و لەیەك جیابوونەوە و پاشان هەریەکەیان لە ڕێگەی خۆیەوە ڕۆیشت.

سەیید لە پێش زیندانی کردنیەوە لە ساڵی (١٩٥٤) زۆری نەمابوو یەکێك لە کچە دیندارە مولتەزیمەکان دەستنیشان بکات، هەنگاوەکانی یەکەمی ئەم کارەی نا، بەڵام ڕووداوە تازەکان بەرەو ڕووی بوونەوە، ڕێگەی هەوڵدانەکانی لێگرت، ستەمکاران خزاندیانە ناو زیندانەوە تاکو ساڵەکانی تەمەنی لە زینداندا بەرێتە سەر، پاشان بە لێبوردنێکی تەندروستی لە ساڵی (١٩٦٤) لە زیندان دەرکرا، کە لەو کاتەدا تەمەنی لە پەنجا و نۆ (٥٩) ساڵ نزیك بووبوویەوە.

یەکەم شتێك دوای دەرچوون لە زیندان بیری لێکردەوە بریتی بوو لە گەڕان بە دوای هاوسەری ژیاندا، گەرا تا نسیبی خۆی دۆزیەوە لە یەکێك لە ئافرەتە چاکەکاندا، ئەوەندەی نەمابوو دەستنیشان و مارەی بکات، ستەمکاران مۆڵەتیان نەدا و هێندەی نەبرد زۆر بە خێرایی تووندیان کردەوە لە زیندان لە ساڵی (١٩٦٥) تاکو بە شەهیدی بۆ دواجار ماڵئاوایی بکات و بگات بە خوای خۆی، لە ساڵی (١٩٦٦) دا شەهیدکرا و ڕۆیشت بۆ بەهەشتی نەبڕاوە تاکو لەوێ پشکی خۆی لە حۆریەکانی بەهەشت وەربگرێ (إن شاء الله) .

**٧) چەند سیفاتێکی بەرزی سەیید لەگەڵ کەسانی چواردەوریدا :**

**یەکەم : بەخشینی ئەساسی ماڵەکەی بە هاوڕێیەکی کە دەیویست ژن بهێنێت:**

مامۆستا عەتار سەردانی سەییدی زۆر دەکرد لە ماڵی خۆیدا لە (حەلوان) ئەمەش لە ساڵەکانی چلەکاندا، دەڵێت : کە ئەساسی ژووری میوانەکەی زۆر سادە بوو بەهۆی کەمدەستیەوە کە نەیتوانیوە ئەساسی چاکتر بکڕێت.

ڕۆژێکیان مامۆستا عەتار سەردانی دەکاتەوە دەبینێت ژووری میوان ئەساسێکی جوان و تازەی لێیە، بەمە دڵخۆش دەبێت!

پاشان دوای چەند ڕۆژێك سەردانی دەکاتەوە دەبینێت ئەساسە کۆنەکان لە ژووری میوان دانراونەتەوە، سەری سوڕما لەوەی کە بینی، بۆیە زۆری کرد لە سەیید تا بزانێت قەنەفە تازەکان چییان بەسەر هاتووە، لەبەر زۆر داکۆکی کردنی، سەیید ناچار بوو هەواڵەکەی پێ بڵێ : کە قەنەفە تازەکانی فرۆشتووە، پارەکەی بەخشیوە بەیەکێك لە برا (ئیمانیەکانی) تا مەسروفاتی ژنهێنانی پێ تەواو بکات!!



أحمد عبدالغفور عطار

دوا نامەی (سەیید قوتب) بۆ هاوڕێی ئەدیبی (أحمد عبدالغفور عطار) بە ڕەگەز (سعودی) کەلە مانگی (صەفەر) ی ساڵی (١٣٨٦) ی هیجریدا بەرامبەر (١٩٦٦) ی میلادی بۆی ناردووە کە بەهۆی ئەفسەرێك لە دەزگای هەواڵگری (عبدالناصر) کاری کردووە پێی گەیشتووە، کە تێیدا نووسیویەتی :

[ لقد وجدت الله : كما لم أجده من قبل قط .. لقد عرفت منهجه وطريقه : كما لم أعرفه من قبل قط .. ولقد اطمأننت إلى رعايته ، ووثقت بوعده للمؤمنين : كما لم أطمئن من قبل قط ..وأنا بعد ذلك على ما عهدتني : مرفوع الرأس، لا أحنيه إلا لله .. والله يفعل ما يشاء .. والله غالب على أمره ولكن أكثر الناس لا يعلمون ..]

**ئەمەش دەقی نامەکەیە بە دەستوو خەتی (سەیید) خۆی :**



بسم الله الرحمن الرحيم

أخي أحمد

السلام عليكم ورحمة الله. وبعد فقد أبلغني [redacted]

أنك تبلغ إليكم بأسى لما أوصيته، وأنك رددت عليه بما أعتبره

فيه من أريحية نفسي .. فهل أشكرك ؟

أحق من أن أشكرك - فيما أعتقد - أن أحمد الله على

وأنا في وضعي الذي تعلم .. لقد وجدت الله كما لم أجده من

قبل قط. ولقد عرفت منهجه وطريقه كما لم أعرفه من قبل

قط. ولقد اطمأننت إلى رعايته ووثقت بوعده لكم كما لم أطمئن

من قبل قط .. وأنا بعد وعدي ما عهدتني

مرفوع الرأس لا أحني إلا لله. والله يفعل ما يشاء، و

والله غالب على أمره، ولكن أكثر الناس لا يعلمون ..

فالذي أرجو وأحب أن أبلغه عني:

لأحد ال[redacted] زميل [redacted] أستشهد له بالأمانة

والاستقامة والثبات. وأحب أن تكونوا له سند

[redacted] إن شاء الله [redacted]

خاطرة [redacted]

والسلام عليكم ورحمة الله

أخوك

سيد

**دووەم : بەخشینی بەدلەکەی بە خوێندکارێکی زانکۆ :**

مامۆستا (عەلی عبدالعزیز حسەین) لـە گوتـاری (شـاهد شـهید) کـە لـە گۆڤـاری (المجتمع) دا بڵاوی کردۆتەوەو ، دەربارەی کوڕەکەی خۆی دەگێڕێتەوە کاتێك کـە قوتابی بووە لە کۆلیـژی (دار العلـوم) و لـەو کاتـەدا (سـەیید قوتـب) وانەبێـژ بـووە لەویێ : ڕۆژێکیان کوڕەکـەم بـۆی گێڕامـەوە، کاتێـك قوتـابی بـووە لـە کۆلیـژی (دار العلوم) ، برای شەهیدمان مامۆستای وانەی ئەدەبی عەرەبی بوو لەویێ، مامۆستا لە سەرەتای ساڵدا دەبینێت ئەم قوتابیە بـە بەدلەیـەکی کۆنـەوە هـاتووە بـۆ زانکـۆ ، چونکە هەموو قوتابیەك بە جلوبەرگی نوێـوە لـەو ڕۆژەدا دەهـاتن و دەچـوون.. لـە کتوپڕێکدا کوڕەکەم بانگکرا بۆ ژوورەکەی مامۆستا (سەیید قوتب) ، کاتێـك چـووە ژوورەوە مامۆستاش بەدلە تازەکـەی خـۆی داکەنـدو داوای لێکـرد کـە ئـەو لەبـەری بکات، مامۆستاش بەدلە کۆنەکەی ئەو هـەڵبگرێت بـۆ خـۆی.. بـەبێ وتوێـژێکی زۆر ئەوەی ویستی ڕوویدا! کوڕەکەی من گەڕایـەوە بـۆ ماڵـەوە، لـە جلوبـەرگێکی جیـا لەوەی کە پێوەی ڕۆیشتبووە دەرەوە، تاکو موفاجەئەکە بەو جلوبەرگـە نوێیـە بـۆ خێزانەکەی زیاتر بێت [١] .

**سێیەم: ئارامگرتنی لەسەر کەمدەرامەتی و خۆبەدەستەوە نەدان بۆ ڕژێمی ستەمکار:**

مامۆستا (ئەحمەد عبدالغفار عەتار) ئەم ڕوداوەمان بۆ دەگێڕێتەوە کە خۆی بە چاوی خۆی بینیویەتی و لەگەڵیدا ژیاوە، دەڵێـت : ڕۆژێکیـان (سـەیید قوتـب) بـە تەلەفۆن پەیوەندی پێوە کـردم، داوای لێکـردم کـە بـەزوویی بگەمـە ماڵیـان، داوای لێکردم کە چەند (دە) جونـەیهێکی بـە قـەرز بـۆ ببـەم (لـە سـییەوە تـا نـەوەد) تـا

---

(١) گۆڤاری (المجتمع) ژمارە (٨٣٢) ، بەرواری : ١ / ٩ / ١٩٨٧.

دەرمانی پێ بکڕێت، چونکە نەخۆش بوو، پارەی نەبوو دەرمانی پێ بکڕێت ! !

منیش بە پەلە ڕۆیشتم بۆ ماڵیان، بڕە پارە داواکراوەکەشم لەگەڵ خۆم برد، کاتێك چوومە ژووری بەخێرهاتنەوە، دیمەنێکی سەیرم بینی، سوێند بەخوا واقم وڕما لەوەی کە بینیم! لە ژوورەکەدا کارمەندێکی دیبلۆماسی لە باڵوێزخانەی وڵاتێکی عەرەبی خاوەن (نەوت) ە وە دانیشتبوو، لەبەردەمیدا جانتایەکی پڕ لە پارەی جۆراو جۆری دانابوو کە کۆی هەمووی دەگەشتە چەند هەزار (جونەیە) ێك! !

ئەو کارمەندە زۆر بە گەرمی و تکاو ڕجاو داکۆکی لێکردنەوە داوای لە سەیید دەکرد کە جانتا پارەکەی لێ وەربگرێت ... ، کە لەو کاتەدا سەیید سەرگەرمی دەرکردنی گۆڤارێکی ئەدەبی و فیکری ئیسلامی بوو – کە لەوانەیە (العالم العربی) یان (الفکر الجدید) – بووبێت.

منیش ڕوانیم بۆ سەیید قوتب کە نەخۆش بوو دانیشتبوو، بینیم خەم و خەفەت بەدەم و چاویەوە دیارە..

پاشان سەیید بە دامەزراویەوە دیاری پیاوەکەی ڕەد کردەوە، تووڕەیی و توندی بە ناوچاویەوە دەرکەوت، لە کاتێکدا پێی دەوت : من خۆم و فیکرەم نافرۆشم بە سەروەت و سامانی دنیا، ماڵەکەت بگێڕەوە بۆ ناو جانتاکەت! !

پاشان سەیید لای بەلای مندا کردەوە و پێی وتم : ئایا ئەوەی داوام لێ کردبووی ئامادەت کردووە؟ منیش پێم وت : بەڵێ ، بڕە پارەکەم دایە، لە کاتێکدا لەوپەڕی سەرسوڕمان و هەڵچوون و واق وڕماندا بووم!

کاتێك دیبلۆماتەکە چیرۆکی ئەم بڕە پارەیەی زانی .... ، بە پەشۆکاوی سەرسوڕمانەوە چووە دەرەوە ! !

**٨) هەوڵ و تێکۆشان و لێبڕان بۆ کاری ئیسلامی :**

دوا بە دوای گەڕانەوەی لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و شاد بوونی بە زێدی خۆی و وڵاتی میسر، بڕیاریدا چیتر خۆی بۆ کاری ئیسلامی یەکلایی بکاتەوە و ئەو تەمەنەی کە ماویەتی بخاتە خزمەتی بانگەوازی ئیسلامیەوە. سەیید نەك هەر زانایەکی تەقلیدی بیر وشك نەبوو، بەڵکو بیریارێکی گەورە بوو، لە گەلێك لە چەمکەکان و جومگە هەستیارەکانی زیندەگیدا ئاخاوتن و ڕای سەربەخۆی خۆی هەبوو... نەدەکەوتە ژێر کاریگەرییەك کە لە دەزگای هزر و ڕوانینی ئەمدا پێك نەدەهاتەوە.

هەر بۆیە لە ساڵی (١٩٥١ م) چووە ڕیزی برایانی موسوڵمان (الإخوان المسلمون) ە وە و ، ساڵی (١٩٥٢) بە ئەندامی (مەکتەب ئیرشاد) ی برایان هەڵبـژێرراو کرا بە سەرۆکی بەشی بڵاوکردنەوەی بانگەواز لە بارەگای ناوەندی برایان.

وە لە هەمان ساڵدا بەشداری کۆنگرەی (دیمەشق) ی کرد، کە لە ژێر ناوی (التربية الخلقية كوسيلة لتحقيق التكامل الإجتماعي) دا گیرا.

وە لە ساڵی (١٩٥٤ م) کرا بە سەرنووسەری ڕۆژنامەی (برایانی موسوڵمان) کە هەر لەو ساڵەدا داخرا، چونکە دژی ڕێکەوتنی میصر و بەریتانیا وەستا. کە پیاوانی شۆڕشی! پۆلیۆی میصری کردیان.

**٩) دانراوو نووسینەکانی :**

سەرجەم کتێبەکانی (سەیید قوتب) خۆی لە (٢٨) کتێبی دانسقە دەبینێتەوە. (٢٦) کتێبیان خۆی لە ژیاندا بوو بڵاوکرایەوە و بە چاپ گەیەنرا ، تەنها دوو کتێب نەبێت ئەویش (نحو مجتمع إسلامي) و (مقومات التصور الإسلامي) بوو کە چاپ

کردنی کەوتە دوای لە سێدارەدان و کۆچی ماڵئاوایی (سەیید قوتب) خۆی.

دانراوو نووسینەکانی (سەیید قوتب) زۆرن و خۆیان لە چەند بوارێکی جۆراو جۆردا دەبینێتەوە :

**یەکەم : دانراوەکانی لە بواری ئەدەبی دا :**

١. **طفل من القرية** (سيرة ذاتية) / بە هەمان شێوە ئەم کتێبەش ) لەلایەن (لجنة النشر للجامعين) ە وە لە ساڵی (١٩٤٦) دا بڵاوکرایەوە.

٢. **أشواك** (رواية) / بریتیە لە چیرۆکی خۆشەویستیەکی ڕاستەقینە، سەیید لە دەروونی خۆیدا لەگەڵ دەسگیرانەکەیدا تیایدا ژیاوە، سەیید ئەم کتێبەی لە مانگی ئاياری (١٩٤٧) دا لە (دار سعد) لە (قاهیرە) دەرکرد.

٣. **المدينة المسحورة** / چیرۆکێکی خەیاڵیە لە چیرۆکەکانی (ألف ليلة وليلة) ە وە وەریگرتووە، (دار المعارف) لە میانەی زنجیرەی (اقرأ) دا ساڵی (١٩٤٦) بڵاوی کردۆتەوە.

٤. **النقد الأدبي**: **أصوله ومناهجه** / لە مانگی حوزەیرانی ساڵی (١٩٤٨) دەری کرد چوارەم و کۆتا کتێبی نەقدی سەیید بوو.

٥. **التصوير الفني في القرآن** / ئەم کتێبە یەکەم کتێبی سەیید بوو، کە لە مانگی نیسانی (١٩٤٥) دا لە (دار المعارف) لە میصر دەرچوو.

٦. **مشاهد القيامة في القرآن** / سەیید ئەم کتێبەی لە مانگی نیسانی (١٩٤٧) دا لە (دار سعد) لە (قاهیرە) دەرکرد، ئەمە دووەم کتێبی بوو لە (مكتبة القران الجديدة) کە دەیویست دەری بکات.

٧. **كتب وشخصيات** / ئەمە سێیەم کتێبە کە لە ساڵی (١٩٤٦) دا بڵاوی بکاتەوە.

٨. **مهمة الشاعر في الحياة وشعر الجيل الحاضر** / ئـەم كتێبـە سـاڵی (١٩٣٣) بە چاپی گەیاندووە.

٩. **الأطيـاف الأربعـة** / ئـەم كتێبـە (خـۆی و محەممـەد و فاتیمـە و ئامینـە نووسیویانە) لەلایەن (لجنـة النشـر للجـامعين) ە وە دەرچـوو، كتێبخانـەی (میصـر) ساڵی (١٩٤٥) چاپی كرد.

١٠. **نقد كتـاب مستقبل الثقافـة في مصـر** / د. تـەها حسـەین ساڵی (١٩٣٨) كتێبێكی دەركرد بەناونیشانی (مستقبل الثقافـة في مصـر) ئـەم كتێبـە مشـتومڕێكی زۆری بە چـواردەوردا دروسـت بـوو، چـونكە (تـەها حسـەین) لـە كتێبەكەیـدا داوای ئـەوەی كردبـوو كـە میصـر ببێتـە بەشـێك لـە جیهـانی ڕۆژئـاوا، هـەروەها داوای وەرگرتنی ژیاری ڕۆژئاواو ڕۆشـنبیری ڕۆژئـاوای كردبـوو بـە تـاڵ و شـیرین و چـاك و خراپییەوە. سەییدیش بۆ بەرپەچدانەوەی ئەم بیروبۆچـوونە لـە ساڵی (١٩٣٩) ئـەم بابەتە لای سەرەوەی نووسی و بە چاپی گەیاند.



دكتور طه حسين

١١. **روضة الطفل** / زنجیرە چیرۆكێك بوو بۆ منـاڵان كـە بـە هاوبەشـی لەگـەڵ (ئەمینە سەعید) و (یوسف موراد) دەریـان كـرد. لـەم باخچـەیە تـەنها دوو بەشـیان دەركـرد: یەكـەم : أرنـب والكنـز. دووەم : كتكـت المـدهش. هـەردوو بەشـەكە (دار

المعارف) ی میصری ساڵی (١٩٤٧) چاپی کرد.




ئەمینە ئەلسەعید        یوسف موراد

١٢. **الجديد في اللغة العربية.**

١٣. **الجديد في المحفوظات** / ئەمانە دوو کتێبی مەنهەجی بوون، بۆ قوتابیانی قوتابخانەکانی وەزارەتی مەعاریف، کە لەگەڵ بەرپرسانی دانانی پرۆگرامەکانی خوێندن لە وەزارەتی مەعاریف دەریان کرد، ئەم کتێبە دان پیانراو بوو، لە قوتابخانەکانی وەزارەتی مەعاریف دەخوێنرا.

**دووەم : دانراوەکانی لە بواری ئیسلامی دا :**

١. **معالم في الطريق** / دواکتێبی سەیید قوتبە کە لە زیندان نووسیویەتی و بە پوختەی دیدی (سەیید) دادەنرێت.

٢. **هذا الدين** / ئەم کتێبە لە زیندان نووسراوە و ساڵی (١٩٦٠ م) لە لایەن دەزگای (دار القلم) لە قاهیرە چاپکراوە.

٣. **المستقبل لهذا الدين** / ڕاستەوخۆ پاش کتێبی (هذا الدين) نووسراوە و لەلایەن کتێبخانەی (وەهبە) وە لە قاهیرە چاپکراوە.

٤. **في ظلال القرآن** / لە هەشت بەرگ پێکهاتووە کە بریتیە لە تەفسیری قورئانی پیرۆز ، سەرەتا لە گۆڤاری (المسلمون) یەکەم ئەڵقەی (الظلال) ی لە ژمارە سێی گۆڤارەکە بڵاوکرایەوە، کە لە مانگی شوباتی ساڵی (١٩٥٢) دا دەرچوو، ئەوەبوو تا

حەوت ئەڵقەی لێ بڵاوکردەوەو ، ئەڵقەی حەوتەم لە ئایەتی (١٠٣) ی سورەتی (البقرة) دا وەستا. پاشان لە کۆتایی ئەڵقەی حەوتەمی (ظلال) لە گۆڤاری (المسلمون) دا سەيید ڕایگەیاند کە لە ئەڵقەی داهاتووی گۆڤارەکەوە بڵاوکردنەوەی تەفسیرەکەی رادەگرێت و لە جێگەی ئەودا باسێکی نوێ بڵاودەکاتەوە، ئەویش (نحو مجتمع إسلامي) بوو. سەبارەت بە تەفسیرەکەشی (الظلال) ڕایگەیاند کە لە کتێبی سەربەخۆدا دەردەکەوێت ، بەپێی ژمارەی جوزئەکانی قورئان هەموو جوزئێك لە قورئان لە جوزئێك لە (الظلال) دا، لە هەموو دوو مانگێکدا جوزئێکی دەردەچێت. بەشی یەکەمی لە مانگی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٥٢) دا دەرچوو لەلایەن (دار الإحياء الكتب العربية) لە قاهیرە چاپکرا. لە ماوەی نێوان تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٥٢) تا کانونی دووەمی ساڵی (١٩٥٤) شانزە (١٦) بەشی لێ دەرکرد. پاشان بەهۆی زیندان و ئەشکەدانی زۆر و دوورخستنەوەی لە بواری نووسینی تەفسیری (الظلال) وەستا ، بەڵام بەهۆی گرێبەستێکەوە کە سەيید بەستبووی لەگەڵ چاپخانەی (دار الإحياء الكتب العربية) لەسەر نووسینی تەفسیری قورئان بە تەواوەتی.. چاپخانەکە سکاڵانامەیەکی دژ بە حکومەت بەرز کردەوە، تیایدا داوای هەزارەها جونەیهی دەکرد وەك قەرەبوونەوە بۆ ئەو زیانەی لێی کەوتووە بەهۆی وەستانی سەيید لە نووسینی تەفسیرەکەی بە بۆنەی حکومەتەوە، حکومەت لە جیاتی پێدانی ئەو بڕە پارەیە ئەوەی هەڵبژارد کە ڕێگە بە سەيید بدات دەست بە نووسین بکاتەوە ، بەڵام بە مەرجێ شێخ (محمد غەزالی) پێش بە چاپ گەیاندنی تەفسیرەکە چاودێری و پێداچوونەوەی بگرێتە ئەستۆ. پاشان کۆکراوەتەوە لە چەند بەرگێکی قەشەنگدا و لە چاپ دراوە. شایانی باسە (في ظلال) لەبەر گرنگیەکەی وەرگێڕدراوەتە سەر زۆرێك لە زمانەکان لەوانە: (ئینگلیزی و، فەرەنسی و، فارسی و، تورکی و، ئوردی و، ئەندەنووسی و، هەروەها هەوڵێك هەیە بۆ وەرگێڕانی بۆ زمانی کوردیش) .



شێخ محمد غەزالی

٥. العدالة الاجتماعية في الاسلام / سەیید پێش سەفەرەکەی بۆ ئەمەریکا ساڵی (١٩٤٨) لە دانانی ئەم کتێبەی لێ بوویەوە و ئەرکی بە چاپ گەیاندنی سپارد بە (محمد قوتب) ی برای، لە مانگی نیسانی ساڵی (١٩٤٨) دا کەوتە بازاڕەوە، ئەمە یەکەم دانراوی سەیید بوو لە فیکری ئیسلامیدا.

٦. دراسات إسلامية / ئەم کتێبە بریتیە لە کۆمەڵە مەقالاتێك کە پێشتر سەیید لە گۆڤارە ئەدەبی و ئیسلامییەکاندا لە پێش شۆڕش هەروەها ڕاستەوخۆ لە دوای شۆڕشدا بڵاوی کردونەتەوە، وەك گۆڤارەکانی : (الرسالة ، الدعوة ، الإشتراكية) ، دواتر لە دوو توێی کتیبێکدا بەناوی (دراسات إسلامية) لە ساڵی (١٩٥٣) دا چاپی کرد، کە کتێبخانەی لیژنەی لاوانی موسوڵمان بۆی بڵاوکردەوە، کە لە سیی و پێنج بابەتی ئیسلامی پێکهاتووە.

٧. السلام العالمي والإسلام / دوای چەند مانگێك لە کتێبی (معركة الإسلام والرأسمالية) سەیید بە کتێبێکی ترِی شۆڕشگێڕانەی ئیعلامی دەرکەوت کە بریتی بوو لە (السلام العالمي والإسلام) هەمان شێوە (دار الكتاب العربي) لە مانگی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٥١) بڵاوی کردەوە.

٨. خصائص التصور الإسلامي ومقوماته / سەیید ئەم کتێبەی تایبەت

کـردووە بـە سروشـت و تايبەتمەندييـەکانی عەقيـدەی ئيسـلامی، پێشـتر لـە ژێـر ناونيشانی (فکرة الإسلام عن الله والکون والحياة والإنسـان) دا ڕايگەيانـد، لـە پاشـدا ناونيشانەکەی گۆڕی بە (خصائص التصور الإسلامي ومقوماته) ، لـە سـاڵی (١٩٦٢ م) دا دەزگای (دار إحياء الکتب العربية) بۆی چاپ کرد.

٩. **معرکة الإسلام والرأسمالية** / لە مانگی شـوباتی ساڵی (١٩٥١) دا لەلايـەن (دار الکتاب العربی) بە چاپ گەيەنرا.

١٠. **قصـص الأنبيـاء للأطفـال** / لەگـەڵ (عبدالحميـد جـەودەت ئەلسـەحار) زنجيرەی يەکەمی لەم زنجيرانە دەرکرد کە کتێبخانەی (سـعد) لـە ساڵی (١٩٤٧) دا لە (قاهيرە) چاپی کرد.

١١. **الإسلام ومشکلات الحضارة** / ئەم کتێبەش لە هـەمان سـاڵدا (١٩٦٢) ، بـە هەمان شێوە لەلايەن (دار إحياء الکتب العربية) ە وە بە چاپ گەيەنرا.

١٢. **مقومات التصـور الإسلامي** / بەشـی دووەمـی کتێبـی (خصـائص التصـور الإسـلامي) يـە و تەواوکـەری ئـەو کتێبەيـە، تەواوکـەری بابەتەکانيـەتی، هـەردوو کتێبەکـە لـە عەقيـدە و تايبەتمەنـديی و خاڵـە بـەهێزەکانی عەقيـدەی ئيسـلامی دەدوێن، ئەمە يەکەم کتێبە کە بيست سـاڵ دوای شـەهيدکردنی خاوەنەکـەی چاپ بکرێت، چاپی يەکەمی لەلايەن (دار الشروق) ە وە ساڵی (١٩٦٨) بڵاوکرايەوە..

**سێيەم : چەند بابەت و نووسينێك کە لە گۆڤارو ڕۆژنامەکاندا بڵاوی کردونەتەوە ، پاشان کۆکراونەتەوە و بە چاپ گەيەنراون:**

١. **سـيناء بـين أطمـاع الاسـتعماريين والصـهيونيين**/ ناميلکەيەکـە برايـانی موسوڵمان ساڵی (١٩٦٧) بڵاويان کردۆتەوە، تيايدا ئەو مەترسيانە ڕوون کردۆتـەوە کە ڕووبەڕووی (سينا) دەبێتەوە، وتەی پێشەوا (حەسەن بەننا) و (سەييد قوتب) و (کاميل شەريف) ی تێدا تۆمار کراوە، بەشی سـەييد لـەم ناميلکەيـەدا بابەتێکـە لـە

گۆڤاری (الرسالة) لە ساڵی (١٩٥٢) دا بڵاوی کردۆتەوە، بە ناونیشـانی (إلى النـائمين في العالم الإسلامي) .


حەسەن بەننا


کامیل شەریف


سەییید قوطب

٢. **الجهاد في سبيل الله** / نامیلکەیەکە (الإتحـاد الإسـلامي للمنظمـات الطلابيـة) ساڵی (١٩٦٩) بڵاوی کردۆتەوە، کە بەرهەمی سێ ناوداری مەیدانی فیکرو بانگەوازە کە برتین لە: پێشەوا (حەسەن بەننا) و (سەیید قوتب) و (ئەبوئەعلای مەودودی) .


ئەبو ئەعلای مەودودی

٣. **معركتنـا مـع اليهـود** / کۆمەڵـە بابـەتێك بـوو لـە سـەرەتای پەنجاکانـدا لـە گۆڤاری (الدعوة) دا بڵاوی کردنەوە ، دواتر (زين العابدين الركابي) ئەو نووسـینانەی کۆکردنەوە و پێشەکیەکی بۆ نووسین و لە کتێبێکدا بـەناوی (معركتنـا مـع اليهـود) لەلایەن (الدار السعودية للنشر) بە چاپی گەیاند.

## سەييد قوتب



زين العابدين الركابي

٤. في التاريخ فكرة ومنهاج / سەييد لە گۆڤاری (المسلمون) دا بابەتێکی لە دوو ئەڵقەدا بە ناونیشانی (في التأريخ فكرة ومنهاج) لە ژمارە یەك و دووی ساڵی یەکەمی گۆڤارەکەدا لە ساڵی (١٩٥١) بڵاوکردەوە، لە دوای شەهید کردنی (دار السعودية للنشر) هەستا بە وەرگرتنی ئەم دوو بابەتە لە گۆڤاری (المسلمون) ، پاشان لەگەڵ دوو بابەتی تری سەييد دەربارەی (التصور الإسلامي والأدب) لە کتێبێکدا بڵاوی کردەوە لە ژێر ئەو ناوەی سەرەوەدا بەبێ ئەوەی ئاماژە بە سەرچاوەی بابەتەکانی بکات.

٥. تصورات إسلامية (مجموعة مقالات في كتاب) .

٦. مفترق الطرق.

٧. قيمة الفضيلة بين الفرد والجماعة.

٨. لماذا أعدموني؟ (مجموعة مقالات كتبتها جريدة المسلمون التي تصدر في لندن باعتبارها الشهادة التي كتبها الإمام بخط يده قبل إعدامه) .

٩. أمريكا من الداخل بمنظار سيد قطب / ئەمەش ئەو زنجیرە باسانە بوون کە سەييد لە کاتی ناردنە دەرەوەی بە یاوەری وەفدێکی وەزاری حکومەتی میصری بۆ ئەمەریکا نووسیونی، پاشان بەڕێز (صلاح خالیدی) ش هەستاوە بە کۆکردنەوە و ئامادەکردنی لە دووتوێ کتێبێکدا بەو ناوەی کە لەسەرەوە ئاماژەمان پێکرد.

 

دکتۆر صەلاح ئەلخالیدی

١٠. **نحو مجتمع إسلامي** / ئەمەش ئەو زنجیرە باسانە بوون سەیید دوای ئەوەی لە ئەڵقەکانی (في ظلال) وەستا دەیناردن بۆ گۆڤاری (المسلمون) ، دواتر (مکتبة الأقصی) پاش لە سێدارەدانی (سەیید) هەستا بە کۆکردنەوەی ئەو بابەتانەی پێشووی سەیید کە لە گۆڤاری (المسلمون) بڵاوی کردبووەوە کردی بە کتێبێك و بەناو نیشانی (نحو مجتمع إسلامي) لەساڵی (١٩٦٩) دا بڵاوی کردەوە.

١١. **افراح الروح** / کۆمەڵێك بیرۆکە و تێبینی و بیربۆچوونی تایبەتی سەیید هەبوون، لە کاتێکدا کە لە ئەمەریکا بوو لە نێوان ساڵی (١٩٤٨) بۆ (١٩٥٠) ، پاشان لە چەند نامەیەکی برایانەی شەخسیدا تۆماری کردن و ناردنیەوە بۆ براو خوشك و هاورێکانی لە میصر و وڵاتە عەرەبیەکان و فەرەنسا و ئینگلتەرە، دوای گەرانەوەی لە ئەمەریکا هەندێك لەو نامانەی لە گۆڤارەکاندا بڵاوکردەوە.

**چوارەم : چەند دانراو و کتێبێك کە لە تەفسیری (في ظلال القرآن) ە وە وەرگیراون لەوانە:**

١. **تفسیر آیات الربا.**
٢. **تفسیر سورة الشوری.**
٣. **طریق الدعوة.**
٤. **فقه الدعوة.**

٥. قصة الدعوة.
٦. رسالة الصلاة.
٧. إسلام أو لا إسلام.
٨. إلى المتثاقلين في الجهاد.
٩. استعلاء الإيمان ومعالم الطريق إلى الله.

**پێنجەم : چەند مەقالات و بڵاوکراوەیەك کە نووسیویەتی:**

١. كيف وقعت مراكش تحت الحماية الفرنسية؟
٢. قيمة الفضيلة بين الفرد والجماعة.
٣. الدلالة النفسية للألفاظ والتراكيب العربية.
٤. هل نحن متحضرون؟
٥. وظيفة الفن والصحافة.
٦. شيلوك فلسطين أو قضية فلسطين.
٧. أين أنت يا مصطفى كامل؟
٨. فلنعتمد على أنفسنا.
٩. ضريبة الذل.
١٠. أين الطريق؟.

**شەشەم : دانراو و نووسینەکانی لە بواری شیعردا :**

١. الصبح يتنفس (قصيدة)
٢. حدثيني (قصيدة) .
٣. هم الحياة (قصيدة) .
٤. هتاف الروح (قصيدة) .
٥. تسبيح (قصيدة) .

٦. أخي أنت حر بتلك القيود.

٧. الشاطئ المجهول / لە ساڵی (١٩٣٥) دا بە چاپی گەیاندووە، دیوانێکی شیعری چاپ کراوی سەییدە، هەروەها کۆتایی دیوانیەتی، چونکە دواتر هیچ دیوانێکی چاپ نەکراوە.

**حەوتەم : ئەو دانراو و نووسینانەی کە بڵاونەکراونەتەوە :**

١- دراسة عن شوقي.

٢- مهمة الشاعر في الحياة.

٣- المذاهب الفنية المعاصرة.

٤- في ظلال السيرة.

٥- في موكب اليمان.

٦- أوليات في هذا الدين.

٧- تصويبات في الفكر الاسلامي المعاصر.

٨- النماذج الانسانية في القرآن.

٩- المنطق الوجداني في القرآن.

١٠- لحظات مع الخالدين.

١١- امريكا التي رأيت.

١٢- أساليب العرض الفني في القرآن.

١٣- هذا القرآن.

١٤- معالم في الطريق: المحجوبة الثانية.

١٥- المرأة في قصص توفيق الحكيم.

١٦- المراهقة اخطارها وعلاجها.

١٧- الكأس المسمومة.

١٨- قافلة الرقيق.

١٩- القصة في الادب العربي.

٢٠- شعراء الشباب أو (الشعر المعاصر) .

٢١- عرابي المفتري عليه.

٢٢- القصة بين التوراة والقرآن.

٢٣- القصة الحديثة.

٢٤- المرأة لغز بسيط.

٢٥- الشريف الرضي.

٢٦- أصداء الزمن.

٢٧- حلم الفجر.

٢٨- القطط الضالة.

٢٩- من أعماق الوادي.

٣٠- الصور والظلال في الشعر العربي.

**١٠) مێژووی شەهیدبوونی :**

لە پاشا (سەيید قوتب) بڕیاری زیندانی کردنی دراو خرایە زیندانی (القلعة ، السجن الحربي ، أبوزعبل ، وليمان طرة) و بۆ ماوەیەکی زۆر لەوێ مایەوە.

وە لە ئایاری (١٩٥٥ م) دا خرایە نەخۆشخانەی سەربازی بۆ تیمارکردنی شوێنەواری سزاو ئەشکەنجەی زیندان و ، نەخۆشییەکانی کە لە زینداندا تووشی ببوون ، وەك : نەخۆشی (سنگ و ، دڵ و ، ڕۆماتیزمی ئێسك) .

وە لە بەرواری (١٢) ی تەمووزی (١٩٥٥ م) دا دادگای گەل (محكمة الشعب!) بۆ ماوەی (١٥) ساڵ زیندانی لەگەڵ کاری گران و ناڕەحەت حوکمی دا بەسەردا!! هەرچەندە نەشیتوانی لەبەر نەخۆشی و ئازارو ناڕەحەتی ئامادەی دادگاکە بێت.

وە لـە سـاڵی (١٩٦٤ م) دوای هەوڵـدانێکی زۆر لەلایـەن (عبدالسـلام عـارف) ی سەرۆکی (کۆماری عێراق) ی ئەوکاتە لە زیندان هێنرایە دەرەوە ، بەڵام دوای چەند مانگێك گیرایەوە و لە زیندان تووندکرا.



عبدالسلام عارف

لە پاش ڕاگەیانراوێکی (جمال عبدالناصـر) لـە (مۆسـکۆ) لەسـەر پیلانێکـی بـۆ داڕێژراو (سەیید قوتب) لە بەرواری (٩ / ٨ / ١٩٦٥) دەستگیر کرایەوە.



جەمال عبدالناصر

لە (١٩ / ١٢ / ١٩٦٥) لێکۆڵینەوە لەگەڵ (سەیید) دا لـە زینـدانی جەنگیـدا بـۆ ماوەی سێ ڕۆژ دەستی پێکرد.

لـــە (١٢ / ٤ / ١٩٦٥) دادگــایی کردنـــی (ســـەیید قوتـــب) لەلایـــەن دادوەر (فەریق محمد فوئاد) دەستی پێکرد.

## وێنەکانی سەیید قوتب لە کاتی دادگایی کردنیدا















لە (٢١ / ٨ / ١٩٦٦) دەجەوی فەرمانی لە سێدارەدانی بۆ (سـەیید) و دوان لـە هاوڕێیانی دەرکرد.



**لیوا محمد فوئاد دەجەوی**

لە بەرواری (٢٩ / ٨ / ١٩٦٦ م) سەیید قوتب لە گەڵ دوان لە هاوەڵانی کە بریتیی بوون لە: (محەممەد یوسف هەواش و عەبدولفەتاح ئیسماعیل) لە سێدارە دران.





**محمد یوسف هەواش**




**عبدالفتاح إسماعيل**

**(١٩٢٥ - ١٩٦٦)**

ڕەحمەت لە گیانی سەییدی مامۆستا ، سەییدی ئەدیب و نووسەر ، سەییدی موجاهید و تێکۆشەر، سەییدی موفەسیر و ڕاڤەکاری قورئان ، سەییدی سیاسەتمەدار و ڕۆشنبیر ، سەییدی ڕاستگۆ و ماندوونەناس ، سەییدی شەهید ...

**١١) ئەو کتێبانەی کە لەسەر (سەیید قوتب) نووسراون:**

١ - سيد قطب الشهيد الحي- صلاح الخالدي.

٢ - الأستاذ سيد قطب - بقلم: عبد القادر عبار.

٣ - دراسة نقدية لأهم ما يميز تفسير في ظلال القرآن عن غيره من التفاسير.

٤ - مراحل التطور الفكري في حياة سيد قطب.

٥ - سيد قطب بين مؤيديه ومعارضيه - أحمد عبد المجيد.

٦ - لماذا أعدم سيد قطب وإخوانه؟.

٧ - معالم الفكر التربوي عند سيد قطب من خلال تفسير الظلال.

٨ - الجهاد في سبيل الله في ظلال القرآن.

٩ - المرأة في كتابات سيد قطب.

١٠ - التوجهات الأدبية والروحية عند سيد قطب في المراحل الأولى من حياته ١٩٠٦ - ١٩٣٨ د. عدنان مسلّم.

١١ - أثر البيئة في فكر وتفسير سيد قطب.

١٢ - سيد قطب ضد العنف - منير الغضبان.

١٣ - في ظلال سيد قطب -وصفي عاشور.

**١٢) هەندێ لە وێنەکانی مامۆستای شەهید :**









The young Sayyid Qutb





سەيید قوتب











سەیید قوتب بە جل و بەرگی زیندانیەوە



سەیید قوتب لە قەفەزی دادگایی دا

**سەرچاوەکان:**

١. سەیید قوتب لە هاتنە دنیاوە تا شەهیدبوون / نووسینی (د. صلاح عبدالفتاح الخالدی) وەرگێڕانی : تارق نەجیب.

٢. چەند سەرچاوەیەکی تر کە لە شوێنی خۆیدا ئاماژەمان پێکردووە.

## پوختەیەك
## لە ژیاننامەی پێشەوا ئەحمەدی موفتی زادە



١) ناوی تەواوی
٢) شوێنی لە دایك بوون و پەروەردەبوونی
٣) ناوی باوك و دایك و برا و خوشكەكانی
٤) قۆناغەكانی خوێندن و پلەی زانستی و لێهاتوویی
٥) هاوسەرگرتنی كاك ئەحمەد
٦) هەڵسوكەوتی كاك ئەحمەد لەگەڵ كەسانی چواردەوریدا
٧) دید و تێڕوانینی كاك ئەحمەد بۆ هەندێ چەمكی ئایینی
٨) كاك ئەحمەد و هەستی نیشتمان پەروەری
٩) كاك ئەحمەد و گرتنەبەری ڕێی بانگەواز
١٠) كاك ئەحمەد و سەفەری حەج
١١) هەوڵ و چالاكیە ئیسلامیەكانی (كاك ئەحمەد) لە پێش ڕاپەڕین و شۆڕشی گەلانی ئێراندا
١٢) هەوڵ و تێكۆشان و دروشمی (كاك ئەحمەد) لە كاتی ڕاپەڕیندا
١٣) هەوڵ و تەقەللای (كاك ئەحمەد) بۆ هێنانەدی ئۆتۆنۆمی ئیسلامی (خودموختاری) بۆ كوردستانی ئێران
١٤) دامەزراندنی (حیزبی موساواتی ئیسلامی)
١٥) هەوڵ و تێكۆشان بۆ دامەزراندنی (شورای مەركەزی سوننەت) كە ناسراوبوو بە
١٥) دانراوو نووسینەكانی
١٦) بەرهەمە تۆماركراوەكانی (كاك ئەحمەد) بەهەردوو زمانی فارسی و كوردی
١٧) دوایین هەوڵ و تێكۆشانی (كاك ئەحمەد) لەگەڵ سەرانی شۆڕش و دەستگیركردنی
١٨) مێژووی كۆچی دوایی
١٩) ئەو كتێببانەی كە دەربارەی (كاك ئەحمەد) نووسراون بە زمانی كوردی
٢٠) هەندێ لە وێنەكانی پێشەوا ئەحمەدی موفتی زادە
سەرچاوەكانی ئەم ژیاننامەیە

# پوختەیەك
# لە ژیاننامەی پێشەوا ئەحمەدی موفتی زادە



**١) ناوی تەواوی :**

(ئەحمەد) ی کوڕی (مەلا مەحمود) ی کوڕی (مەلا عبداللە) ی دشەیی یە.

**٢) شوێنی لە دایك بوون و پەروەردەبوونی :**

لە مانگی بەهمەنی ساڵی (١٣١١) ی کۆچی هەتاوی ، بەرامبەر (١٩٣٤) ی زایینی، لە شاری (سنە) ی پایتەختی کوردستانی ئێران، لە بنەماڵەیەکی ئایینی و خاوەن زانست ، بەناوی بنەماڵەی (موفتی) چاوی بە دنیا هەڵهێناوە.



شاری سنە

**٣) ناوی باوك و دایك و برا و خوشكەكانی :**

**أ- باپیری و باوكی و مامەكانی :**

ناوی باوكی (مەلا مەحمود) ی موفتی كوڕی عەللامە (مەلا عبداللە) ی دشەیی یە ، مامۆستا (مەلا عبداللە) خەڵكی (دشە) ی لای شاری (پاوە) یە و ، لەوێوە هاتۆتە شاری (سنە) و لەوێ سەقامگیر بووە.

ئەم بەڕێزە ساڵەكانی فەقێیەتی لەناوچەكانی كوردستانی ئێران و عێراقدا ڕابواردووە، پاشان دەبێتە یەكێك لە زانایانی گەورە و ناوداری كاتی خۆی لە كوردەواریدا ، هێندە زانایەكی شیاو دەبێت كە بەناوی (عەللامەی دشەیی) ناوبانگ پەیدا دەكات و، لە (سنە) دەبێتە وانە بێژی مزگەوتی جامیعە (دار الإحسان) ی (سنە) و، موفتی كوردستانیش.

مامۆستا (مەلا عبداللە) خاوەنی شەش كوڕ بووە كە گشتیان زانا و بەناوبانگی كات و وڵاتی خۆیان بوون ، كە ئەمەش ناوەكانیانە :

١) مامۆستا مەلا (مەحمود) كە كوڕە گەورەی بووە و ، باوكی (كاك ئەحمەد) بووە، لە هەموو زانیاریە ئاینی یەكاندا دەستی باڵای هەبووە ، بە تایبەت لە :

(فقه) و (أصول الفقه) و (فەلسەفە) دا ، هێشتا باوکی لە ژیاندا بووە کە بووەتە (موفتی) و حاکم شەرعی کوردستان و یەکێك لە مامۆستایانی فیقهی شافیعی زانستگای تاران.

٢) مامۆستا مەلا (محەممەد ڕەشید) کە زانایەکی گەورە بووە و، لە شاری (بەیروت) ی لوبنان کۆچی دوایی کردووە.

٣) مامۆستا مەلا (خالید) ی موفتی ، موفتی و حاکم شەرعی ڕەسمی کوردستان تا ساڵی (١٣٥٥) ی کۆچی هەتاوی.

٤) مامۆستا مەلا (موحەممەد) ی موهری، بە ناوبانگ بە (برهان الإسلام) کە وانەبێژ و مامۆستای (حقوق و أدبیات) عەرەب بووە، لە زانستگای ئەستامبوڵی تورکیا.

٥) دکتۆر (موحەممەد) سدیقی موفتی زادە، دوکتۆرای (ئیلاهیات) و مامۆستای زمانی کوردی لە زانستگای تاران ، ماوەیەکیش لە بەشی کوردی ڕادوێی تاراندا وانە دەڵێتەوە.

٦) دوکتۆر (عبدالرحمن) موفتی زادە ، کە زۆر مرۆڤێکی دڵپاك و پیاوچاك بوو.



دکتۆر محمد صدیقی لەلای ڕاستەوە



وێنەی کاک ئەحمەد و مامۆستا مەلا مەحمودی باوکی

**ب- براکانی:**

کاك ئەحمەد تەنها دوو برای هەبوو، ئەویش بەناوی کاك (عبداللە) و کاك (هادی) ، براکانی کاك ئەحمەد هەرچەندە چالاکی ئایینیان نەبوو، بەڵام مرۆڤێکی تێگەیشتوو بە ئیمان بوون، هەردووکیان دوای (کاك ئەحمەد) کۆچی دواییان کردووە.

**ج- خوشکەکانی:**

کاك ئەحمەد تەنها یەك خوشکی هەیە ئەویش بەناوی (سەعیدە خان) ، کە هاوسەری (بابا مەردۆخی ڕۆحانی) بوو، (بابا مەردۆخ) یەکێکە لە کەسە لێهاتووەکانی بواری شیعر و ئەدەب و بە هەرسێ زمانی (کوردی ، فارسی ، عەرەبی) نووسیویەتی.

لە بنەڕەتدا (بابا مەردۆخ) نازناویەتی و ناوی خۆی (ئیسماعیل) ی کوڕی شێخ

(حبیب الله ڕۆحانی کاشتری) یـە و ، لەسـەر دەسـتی هـەردوو زانـای گـەورە (مـەلا عبدالعظیم) و (مەلا محمودی موفتی) سنە ئیجازە نامەی وەرگرتووە.



بابا مەردۆخی ڕۆحانی

## ٤) قۆناغەکانی خوێندن و پلەی زانستی و لێهاتوویی :

(کاك ئەحمەد) هەر لە منداڵیدا زۆر زیرەك و بلیمەت بووە، بە ڕادەیەکی وا کـە کەم کتێبی دەرسی تا ئاخر خوێنـدووە، لەگـەڵ ئەمەیشـدا هـەر بـە موتـاڵای خـۆی توانیویەتی ئەو کتێبانە لە ڕادەیەکی بەرزدا بڵێتەوە.

ئەو هەر لە حوجرە خنجیلانەکانی ئەو کاتەی کوردسـتاندا وانـەی خوێنـدووە ، وەك شارەکانی (سنە ، مەریوان ، بیارە ، سلێمانی ، .. هتد) .

وە لێی دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی: یەکەم جار لـە گونـدی (باڵـەك) لـە نزیـك (مەریوان) لای مامۆستا (مـەلا بـاقر) دوو مـانگ ماومەتـەوە و، کتێبـی (سـیوطي) م لەلای خوێندووە، دواتر چوومەتە شارۆچکەی (بیارە) لە کوردسـتانی عێـراق و، لای مامۆستا (مەلا عبدالکریم مدرس) ماومەتەوە و، (عبدالله یزی) و (طلمبوی برهـان) م لەلای خوێنـدووە. پاشـان (هـەر بـە نیـازی خوێنـدن لـە سـاڵی ١٩٥١ دا) چـوومەتە

(تەوێڵە) و، دواتریش چوومەتە گوندی (عەبابەیلێ) ی نزیك (هەڵەبجە) [1] .




مامۆستا مەلا عبدالكريم مدرس　　　　مامۆستا مەلا باقر

هەروەها دەفەرموێ: ئەو کەڵکەڵە و موشتاقە عەجیبە لە دڵما پەیدا بوو، ڕۆشتم ئەو ماوە لە دێهاتی کوردەواری مامەوە لە عێراق، تەنها ماوەیەك نەبێت، کە لاموایە مانگێك دەبوو لە (سلێمانی) بووم لە مزگەوتی (بن تەبەق) ، کە مامۆستا (مەلا مصطفى زەڵمی) هەورامان، مامۆستا بوو لە خزمەتی ئەودا بڕێك دەرسم خوێند، چەند شتێك ڕوویدا تا وای لێهات گەڕامەوە بۆ دێهات و لە گوندی (عەبابەیلێ) و (هەڵەبجە) و ئەوانە دەرسم خوێند [2] .

هەروەها دەفەرموێ: پێموابێت کۆتا زستانم بوو لە (عێراق) ، لە ناوچەی (سەرگەڵو) کە لەوانەیە بکەوێتە باکوری خۆرئاوای (سلێمانی) یەوە، برادەرێکم هەبوو (مەلا عبدالله بانەیی) ، بڕیار بوو لەلای من دەرس بخوێنێت، زۆر هانی دام،

---

(١) (ژیاننامەی زانای گەورەی کوردستان مامۆستا ناصری سوبحانی ــ ئامادەکردنی: عبدالله عبدالعزيز عەبدی / ل ١٦٣) .

(٢) لە کاسێتی (ئەمانەت) وەرگیراوە، ئەم کاسێتە بریتیە لە وتارێکی (کاك ئەحمەد) لەبارەی ئەمانەتداریەوە.

کە مەلایەکی خوێنەوار هەیە، وتی: بابچم بۆلای بزانم لەوێیە، ئەگەر لەوێش نەبوو لە (پشدەر) مەلایەکی باش هەیە دەچین بۆلای، هەر چۆنێك بێت مەلایەکی باش پەیدا دەکەین کە دڵخۆش ببین..



گوندی سەرکەڵو



بە پۆشاکی مەلایەتیەوە



وێنەی کاک ئەحمەد

هەر لە ساڵەکانی گەنجیدا (کاك ئەحمەد) وانەی وتۆتەوە لە خوێندنگای ئایینی

مزگەوتی (دار الإحسان) ی (سنە) .



مزگەوتی (دار الإحسان)

پاشان چۆتە تاران و لە دەفتەرێکی (ئەسناد و ئەملاك) [1] دا کاری کردووە، ماوەیەکیش لە زانستگای تاران بەشی زانیاری ئایینی وانەی وتۆتەوە، لە ڕادوێی تاران و کوردستانیشدا کاری کردووە ، پاش بەجێ هێشتنی تاران لە ساڵی (١٣٤٢) ی کۆچی هەتاویدا و گەڕانەوەی بۆ وڵاتەکەی کە کوردستانە، یەك دوو ساڵێکیش لە دێکانی (زاخە) و (بەردەڕەش) ی سەر بە شاری دیواندەرە خەریکی کاری کشتوکاڵ بووە.

(١) واتە: نوسینگەی کڕین و فرۆشتنی خانووبەرە.




سێ چوار ساڵیش پێش ڕاپەڕینی خەڵکی موسوڵمان تا ئەو کاتە لەگەڵ چەند کەسێکی تردا شەریکەی هاوبەشی دروست کردنی خانووبەرەو پرد و لولە کێشی ئاو، بە ناوی (ئەمانیە) دەبەن بەڕێوە.

**٥) هاوسەرگرتنی کاک ئەحمەد :**

(کاک ئەحمەد) دوو ژنی هێناوە ، ژنی یەکەمی بە ناوی (حەسیبە خانم) ، کە خوشکەزای دایکێتی و لە کاتی فەقێیەتیدا دایکی بۆی خواستووە، بەڵام زۆری پێ ناچێ دەردەکەوێ کە بابەتی یەك نین و بۆ یەك نابن و ئیتر بە ڕەزامەندیەوە لێك جیا دەبنەوە.

ژنی دووەمی ناوی (خەدیجە) ی موهتەدی بووە ، کچی حاجی (ڕەحماناغای) موهتەدی بۆکانە، حاجی (ڕەحماناغا) یش کەسایەتیەکی زانیاری ئایینی بووە، کە ئەو کاتە لەگەڵ باوکی (کاك ئەحمەد) لە تاران ، لە زانستگا مامۆستای فیقهی مەزهەبی ئیمام شافیعی دەبن، هاوڕێیەتی حاجی (ڕەحماناغا) لەگەڵ باوکی (کاك ئەحمەد) و ، وریایی و لێهاتوویی (کاك ئەحمەد) یش هانی دەدا کە بیکاتە زاوای خۆی، زۆر کات (کاك ئەحمەد) بەخێر و خۆشەویستی و ڕەزامەندیەوە باسی لە خاتوو (خەدیجە) دەکرد ، ئەم خاتوونە بەڕێزە لە ساڵی (١٣٥٠) ی کۆچی هەتاویدا

دڵە گەورەکەی لە لێدان کەوتوو ماڵئاوایی لە دنیای فانی کرد.

شایانی باسە (کاك ئەحمەد) لەم خێزانەی تەنها یەك کوڕی بووە ئەویش بە ناوی (حەمە ژیان) کە ئێستا لە ژیاندا ماوە و خاوەنی ماڵ و منداڵی خۆیەتی ، خوای گەورە خۆی و ماڵ و منداڵی بپارێزێ ..




کاك ئەحمەد لەگەڵ حەمەژیانی کوڕی

**٦) هەڵسوکەوتی کاك ئەحمەد لەگەڵ کەسانی چواردەوریدا :**

**یەکەم:** یەکێك لە ئەندامانی (ڕێکخراوی چریکەی فیدایی خەلق) بەناوی (ع – ب) لە زیندانی (ئەوین) ، وەحدەی (٣٢٥) ، بەندی (٣) ماوەی دوو ساڵ لەگەڵ (کاك ئەحمەدی موفتی زادە) دا زیندانی بووە.

دەڵێت : وەحدەکەی ئێمە (١٢٠) کەس بوو، (٢٠) کەسیان لە کەسە ناودارەکانی وەك (عەباسی ئەمیر ئینتیزام) و (بابەك زەهرایی) بوون، کە (بابەك زەهرایی) لە سەرانی چریکەکانی فیدایی و لە گەورەترین تیرۆریستەکانی ئەو ڕێکخراوە بوو، باوکی و باوە گەورەی لە (ڕۆحانییەکان) بوون.




عەبباسی ئەمیر ئینتیظام        بابەک زەهرایی

هەروەها دەڵێت : (کاک ئەحمەد) بۆ ئێمە وەك دەرزی ئازار شکێن بوو، ئەو منی بەدفەڕ و شەڕانی جەزبی خۆی کرد، من حەریص و تینووی بووم و زۆر بە سۆراغی دەڕۆیشتم.

لە خراپترین تا چاکترین کەسی ناو زیندانەکە ڕێزیان لێ دەگرت و هەیبەتێکی تایبەتی هەیبوو، پیاو کوژێك کە لەسەر شەقامەکان ڕێگەی بە خەڵکی گرتبوو، (٢٧) کەسی کوشتبوو کەچی کاتێك بە لای (کاک ئەحمەد) دا تێدەپەڕی لە شەرماندا سەری دادەخست، (کاک ئەحمەد) وەك مرۆڤێك خۆشی دەویست و موحیببەتی پێ دەدا، بەڵام ئەو لەتاو شەرم نەیدەتوانی تەماشای چاوەکانی بکات.

هەموو زیندانیەکانی ئەو (جەناحە) پێیان خۆشبوو لەگەڵ (کاک ئەحمەد) مامەڵەیەك بکەن، سڵاوێکی لێ بکەن و تەوقەیەکی لەگەڵدا بکەن، تەنها ئەو چەند ساتە کەمە بەسبوو بۆ ئەوەی چەند ڕۆژێك بەو لەزەتەوە ژیان بگوزەرێنن.

زۆر پاك و خاوێن و بە لەزەت نانی دەخوارد، زۆربەی جار ئاووگۆشت یان نۆکاو بوو. نۆکەکەی جیادەکردەوە و نانی ورد دەکردە ئاوەکەیەوە، پاشان خوێی زیاتری دەکرد بە نۆکەکەدا ئاوا زۆر حەزی لێ دەکرد. هیچ کەسێك ئەوەی لێی دەمایەوە هەڵی نەگرت، بەڵکو دەیڕشت، تەنها (کاک ئەحمەد) نەبێت ئەوەی لێی دەمایەوە هەڵیدەگرت و پاشان حەزی لێدەکرد و دەیخوارد!

من ئەوکاتە گەنج بووم و شتێکی وام نەدەزانی، نە قسە کردن، نە

پرسیارکردن، هەمیشە سەرنجم لە هەڵسوکەوت و جموجۆڵی (کاك ئەحمەد) دەدا و، لە خوام دەویست کارێکی هەبێت و بیسپێرێت بە من.

هەر چەند پێم خۆش بوو وەك کوڕی خۆی کاری بۆ بکەم، بەڵام هیچ کات ڕێگەی نەدەدا کاری بۆ ئەنجام بدەم. چەندین جار کە دەچووین بۆ حەمام من خاولیم بۆ دەبرد، نەیدەهێڵا کەس کاری بۆ بکات، هەرکات پێداگریم بکردایە دەیووت: کوڕم! هێشتا قاچەکانم توانایی ڕێ و ڕۆشتنیان هەیە، بۆیە دەبێت خۆم کارەکانم ئەنجام بدەم.

(بابەك زەهرایی) پەیوەندیەکی تایبەتی بە (کاك ئەحمەد) ە وە هەبوو، زۆر بڕوای پێی هەبوو، ئەگەر کێشەیەکی بۆ پێش بهاتایە دەچوو ڕاوێژی پێ دەکرد. کاتێك کە (ئیمام خومەینی) نامەی بۆ (غورباتشوف) نووسی، ئەوان داوایان لە (بابەك زەهرایی) کرد لەو بارەیەوە بۆچوونی خۆی بڵێت، ئەگەر بیوتایە قبوڵمە لە ڕابردووی خۆش دەبوون، ئەگەر ڕەدی بکردایەتەوە خۆی گیردەکردەوە لە زیندان. ڕاوێژی بە (کاك ئەحمەدی موفتی زادە) کردبوو، وتبووی: ڕاستگۆیانە بۆچوونی خۆت بڵێ.



خومەینی



غورباتشوف

لە دەرگاوان و حەرەس تا گەورەترین بەرپرس هەموویان لە (کاك ئەحمەد) شەرمیان دەکرد، ئەویش لە قیافە و قەد و بالای نە دەترسان، بەڵکو لە نیگا و مەعەنەوییەتی شەرمیان دەکرد.

ئەوکەسانەی ئەشکەنجەیاندا زۆر پاشگەز و پەشیمان بوون، هەریەکەیان بە بەلایەك گرفتار بوو. (حاجی مەهدی) لوغمی پێدا تەقییەوە و سێ بەشی جەستەی نوقسان بوو. وتبووی: پاداشتی ئەنجامی ئەشکەنجەدانی (ئەحمەدی موفتی زادە)م وەرگرت، بیستبووم وتبوویان: ئەگەر خۆش بەخت بووینایە ئەرکی ئازاردانی (ئەحمەدی موفتی زادە) یان بە ئێمە نەدەسپارد!

یەکێك لە زیندانییەکان ئەفسەری هێزی ئاسمانی بوو، لە پیلانی کودەتادا دەستی هەبووە، بۆیە زیندانی کرابوو. لەگەڵ (کاك ئەحمەد) پێکەوە بوون. دەیووت: چەندین ساڵ نیزامی بووم و هەموو جۆرە مرۆڤێکم بینیوە (دەسەلاتدار، سەرسەخت، باش، خراپ) بەلام هەرگیز نەمدیوە مرۆڤێك ئەشکەنجە بدرێت و شەقازلە بخوات و زەردەخەنە لەسەر لێوەکانی نەبڕێ ! (کاك ئەحمەد موفتی زادە) لە کاتی ئەشکەنجەدانیدا بە زەردەخەنەوە دەیڕوانی بۆ ئەشکەنجەدەرانی، جا زەردەخەنەی مەسخەرەکەر و گاڵتەجاڕانە نا، بەڵکو دڵی بۆ بەدبەختی ئەشکەنجەدەرانی دەسووتا.

لەگەڵ هەموو کەسێکدا بە موحیبەت بوو، ئەوانی دیکەش موحیبەت لەوەوە فێربوون. (دکتۆر شیرازی) کورد بوو لە حەوشەکەدا نانی بە مێروولەکان دەدا ئەم وانەیەش لە (کاك ئەحمەد) ەوە فێر ببوو.

دەیووت: من هیچ کارە نیم هەمووتان دەتوانن (ئەحمەدی موفتی زادە) بن. خوای گەورە هیدایەتی لە دڵی هەمووتاندا ڕواندووە تەنها پێویستی بەوەیە چرا بگرنە دەستتان و حەرەکەت بکەن.

ئەو تەنها دەیووت: (مرۆڤ) بە، ڕێزی بۆ هەموو کەس دادەنا و لەگەڵی بە موحیبەت بوو، هەرگیز نەمبینی بە کەسێك خراپ بڵێت، نەمبینی کەسێك نەفرین

بکات، ئەو تەنانەت دوژمنەکاشی نەفرین نەدەکرد.

بۆچوونی (موفتی زادە) دەربارەی دوژمنەکانی ئەمە بوو دەیووت: کورِم! گریمانەی ئەوە بکە لە کۆڵانێکەوە تێدەپەڕیت و منداڵێك بەردێکت تێدەگرێت و بەر سەرت دەکەوێت و سەرت دەشکێنێت، تۆچی دەکەیت؟ تۆش دەڕۆیت و حەقی خۆت دەکەیتەوە و سەری دەشکێنیت؟ نا ئەوانە منداڵ گەلێکن و بەرد دەگرنە منی ڕێگوزار.

مرۆڤێکی زۆر گەورەبوو! بێ ئەندازە دوعای بۆ هەموو مرۆڤەکان دەکرد و دەیوت: خودایە ئەگەر دەکرێت هەموو دەردەکانی عالەم بدە بەسەرمندا تا کەسێك دەردەدار نەبێت. تەنانەت ئارەزووی ئەوەبوو دوژمنەکانیشی دەردەدار نەبن!

هەروەها دەیفەرموو: بەخودا قەسەم ئامادەم تەواوی عومرم بە ئەزیەت و ئازار و ئەشکەنجەوە ببەمە سەر و، لە قیامەتیشدا (بە بێ ڕسوایی) لەبەرامبەر خواوە بوەستم و عەزاب بدرێم بە مەرجێك تەواوی بەندەکانی خوا لە خۆشبەختیدا بن... خودایا لەبەر خاتری من هیچ بەندەیەکی خۆت عەزاب مەدە..

ڕۆژێکیان چەند منداڵێك بە شێوەی کۆڕ لە تەلەفزیۆندا قورئانیان دەخوێن، زۆر زۆر گریا و وتی: کورِم! دەبینیت ئەوانە قورئانیان وەك یاری گرتووە، لە کردەوەدا چەنێك لە قورئانەوە دوورن. دەیفەرموو: تاوانی من پارێزگاری کردنە لە قورئان.

(کاك ئەحمەد) دەیفەرموو: تەماشای ئەمرۆ مەکە لەم چوار دیوارەداین، ڕۆژێك دێت دەبینیت ئەندێشە و ڕێگای من پەیڕەوی زۆر دەبێت.

هەروەها دەڵێ : (کاك ئەحمەد) تێکەڵاوی لەگەڵ هەرکەسێکدا بکردایە دینی تێدا دەوەشاند. دەتوانم لەیەك ڕستەدا بڵێم : (ئەحمەدی موفتی زادە) بە مانای واقیعی ئینسان بوو. ئەو باسی دینی نەدەکرد، ئەهلی قسە کردن نەبوو تەنها بە

مەعنەوییەت، بە ئەخلاق و شەخصییەت و ویقار دینی دەوەشاند. کاتێك هـەواڵمان بیست لە زیندان مەرەخەس بووە، تەنانەت ئەوانەش کە حوکمی سێدارەیان هـەبوو لەبـەر خـاتری حوکمەکـەی خۆیـان ناڕەحـەت نـەبوون، بـەڵکو لەبـەر خـاتری دوورکەوتنەوەی (کاك ئەحمەد) لێیان حەسرەتیان دەخوارد.

مرۆڤ ئەگەر هاوسەر یان منداڵەکەی لە دەست بدات دوای (١٨) ساڵ کەم کـەم ئاسایی دەبێتەوە لەلای، بەڵام دوای (١٨) ساڵ تا ئێستا (ئەحمەدی موفتی زادە) م لەلا ئاسایی نەبۆتەوە، تا ئێستا یەك ڕۆژ لە هەموو یادگارییەکانم نەسڕاوەتەوە کـە لەگەڵیدا بووم.

هەرکەسێك ئەوی خۆش بوێت ئەوا منیش خۆشم دەوێت و، شانازی دەکـەم لـە خزمەتی (ئەحمەدی موفتی زادە) دا بووم، من ئەوکاتە دەرکم بەوە نەدەکرد ئێستا دوای (١٨) سـاڵ دەزانم چـەنێك پێویسـتم پێیـەتی، دەزانم ئێسـتا ئێـوەش قـەدری نازانن.

ئەگەر تا بەیانی باسی (ئەحمەدی موفتی زادە) بکەم پێم خۆشە و ماندوو نابم. ئەم شەو دوای (١٨) ساڵ خۆشترین شەوی منە.

لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا، کە خۆشترین یادگارییت لە زینداندا چی بوو؟ وتـی: ئەو کاتە بوو کە لەسەر بینینی (کاك ئەحمەد) کوتەکم خوارد [(١)] .

**دووەم:** زانای بەناوبانگی کوردستانی ئێران مامۆستا (مـەلا محمد ڕەبیعـی) لـە وتارێکـدا کەلـە مەراسـیمی بـە خـاك سـپاردنی (کـاك ئەجمـەدی مـوفتی زادە) دا پێشکەشی کردووە، دەڵێت : (کاك ئەحمەد) ئەو پیاوە بوو کـە دەچـووە دەرەوەی ماڵ، کەسێکی هەژاری دەبینی چاکەتی لەبەردا نییە چاکەتەکەی خۆی پێدەدا، یان

---

(١) (بونیادی خێزان و پەروەردەکردنی تاك ـ سەروەت عبدالله / ل ١٣ ـ ٢٠) .

هەژارێکی دەبینی پێڵاوی لە پێدا نییە پێڵاوەکانی خۆی پێ دەدا ، بۆیە دەبینرا زۆرجار گەڕاوەتەوە ماڵەوە یەکێك لەوانەی بەخشیوەتە هەژار و نەدارێك [١] .



مامۆستا مەلا محمدی ڕەبیعی

**سێیەم:** ئەم بەسەرهاتە هی کەسێکە کە وەختی خۆی لە سەرەتای ئینقلابدا یەکێك بووە لە ئەندامانی (کۆمەڵەی مارکسی کوردستانی ڕۆژهەڵات) دوای ئەو کردار و گوفتارانەی بەرامبەر بە (کاك ئەحمەد) بەکاری دەهێنێ و ئەویش بە ئارامی و شیرینیەوە وەڵامی دەداتەوە لە کۆتایی دا لەسەر دەستی (کاك ئەحمەد) تۆبە دەکات.

بەسەرهاتەکەش ئەوکەسە بە دەمی خۆی بۆمان دەگێڕێتەوە کە بەم جۆرەیە: من کەسێك بووم لە کاتی ئینقلابدا خزمەتێکم بە گەل و نیشتمان پێ نەدەکرا، جگە لەوەی ڕۆژانە چارەکە سەعاتێك تا بیست خولەکێك بە تەلەفۆن جوێن و قسەی ناشرین و ناشایستەم ئاڕاستەی (کاك ئەحمەدی موفتی زادە) دەکرد، بەم شێوەیە زیاتر لە دوو مانگ و نیو بەردەوام بووم.

---

(١) (بونیادی خێزان و پەروەردەکردنی تاك ـ سەروەت عبدالله / ل ١٥٣ ، ٢٢٢) .

قسەکانی من بۆ گێڕانەوە ناشێن لەبەر ناشیرین و نابەجێی ی، ئەگەرنا سەگ بۆنی پێوە نەدەکرد! (کاتێك ئەم پیاوە قسەکانی دەگێڕایەوە دەگریاو هۆن هۆن فرمێسکی شەرمەزاری و پەشیمانی لە چاوەکانی دەهاتە خوارەوە) کاك ئەحمەدیش هەموو جارێك دوای ئەوەی من لێ دەبوومەوە، دەیفەرموو: براگیان تەواو بوویت؟ ئیشت نەما؟ ئەم وت: هیچی تری خراپم لەبیر نییە پێتی بڵێم، ئینجا بە دەنگێکی نەرم کە هەرگیز لە یادم ناچێت، دەیفەرموو: کاکەگیان من زۆر لەوە خراپترم کە تۆ دەیزانی، خوا باش من دەناسێت، ئەگەر تۆ باش منت بناسیایە زۆر خراپترت پێ دەوتم، چونکە شایستەی خراپترم.

ڕۆژێکیان بیرم لەوە کردەوە کە پیاوە گەورەکانی ئێمە هەرگیز بە خۆیان ناڵێن خراپ و، بەردەوام وەسفی خۆیان دەکەن و زۆر کەیف خۆش دەبن و، کاتێکیش کەسێك پیایاندا هەڵدەدات باڵا دەکەن، کەسێکیش هەڵەیەك بکات بەرامبەریان بازنەی سووری بە دەوردا دەکێشن و منداڵەکانیشی لەناو دەبەن، ئەی ئەم پیاوە بۆ وانییە؟ لەو کاتەدا لە دڵی خۆمدا وتم: ئەرێ ئەم پیاوە ئەم هەموو هێرشە ناڕەوایەی دەکەمە سەر، چیای سەخت و سەرکەشە، یان زنجیرە چیای کوردستانە، کەژی کەلیخانە، چۆنە ئەوەندە خۆڕاگرە؟! دەی بەخوا دەبێت سەردانی بکەم و بیبینیم، وادیارە پیاوێکی زۆر گەورە و مەزنە.

بەڵێ چوومە بازاڕ بۆ دوکانێکی گوڵ فرۆش و گوڵێکی جوان و گران بەهام هەڵبژارد، کە شایستەی ئەو پیاوە گەورەیە بێت، کە نزیکەی سێ مانگە بە هەر وشەیەکی خراپ کە زانیبێتم بۆم نەلەخشاوە، گوڵەکەم هەڵبژارد و بە ترس و لەرزەوە ڕۆشتم. کاتێك لە دەرگامدا زۆر بە گەرمی فەرموویان لێکردم، چوومە ئەو ژوورەی (کاك ئەحمەد) ی لێبوو، سەلامم کردو گوڵەکەم لەبەردەمی دانا و

ویستم قاچ و دەستی ماچ بکەم نەیهێشت، هەر چۆنێك بێت ئەملاو ئەولایم ماچ کرد. وتم: قوربان دەمناسی؟ سەری بەرز نەکردەوە و لەبەردەم خۆیەوە فەرمووی: ئەرێ خەڵکینە چۆن کەسێك ناناسم نزیکەی سێ مانگە هاوڕێمە و هەموو ڕۆژێك بیست خولەك پێکەوە قسە دەکەین؟!

لەو کاتەدا هەستم کرد لەبەردەم پیاوێکی زۆر گەورە و پایەداردا دانیشتووم و تاوانەکەشم زۆر گەورەیە... ئینجا فەرمووی: ئەو گوڵە هەڵگرە و بیبەرەوە بۆ دوکانەکە و پارەی گوڵەکەم بۆ بهێنەرەوە، منیش یەکسەر بە گوێم کرد، بێ سێ و دوو، چوومە بەردەم دوکانەکە و گوڵەکانم دایەوە و داوای پارەکەم کرد، بینیم (خاوەن دوکانەکە) پێی ناخۆش بوو، وتی: لە ماوەیەکی کەمدا ئەمە زیاتر لە (٢٥٠) گوڵیان بۆ هێناومەتەوە، جەنابیشت بۆ (کاك ئەحمەدی موفتی زادە) ت برد؟ وتم: بەڵێ، وتی: بە مەرجێك لێت وەردەگرمەوە، کە دوای ئەوەی پارەکەت بۆ برد، پێم بڵێیت چی لە پارەکە دەکات؟ منیش بەڵێنم پێدا.

پارەکەم بردەوە، لە بەردەمی (کاك ئەحمەد) دامنا، فەرمووی: کاکە هەڵیبگرە، بیبە بۆ ماڵی فلان هەتیوو لە فلان شوێن، ناو نیشانەکەشی دامێ، کە چووم بۆ ماڵەکە ڕاستبوو بێوەژنێکی هەژار لەگەڵ منداڵێکی هەتیوو لە خانوویەکی کۆندا بوون، پارەکەم دایە دەستی بێوەژنەکە و گەڕامەوە، لە ڕێگەوە چووم بۆلای کابرای گوڵفرۆش و بەسەرهاتەکەم بۆ گێڕایەوە، وتی: توخوا بەجێم مەهێڵە، منیش لەگەڵ خۆت ببە بۆلای ئەو پیاوە. دوو دوو ڕۆیشتین بۆ خزمەتی (کاك ئەحمەد) و هەردووکمان لەسەردەستی تەوبەمان کرد... [1]

---

(١) (پایزە برا ـ مەلا ئەحمەدی شەریعەت / ل ٧٠ ـ ٧٢).

### ٧) دید و تێڕوانینی (کاك ئەحمەد) بۆ هەندێ چەمکی ئاینی [١] :

**یەکەم :کۆمەڵگای (ئاینی)** : ئەوەیە کەوا (قورئان) بۆمان دیاری دەکا و تێمان دەگەیەنێ کە بریتیە لە کۆمەلگایەك بەبێ ئیمتیازات، بێ چینایەتی، بێ گەورە و بچووك، کۆمەڵگای بێ ئەداو ئەتوار، کۆمەڵگای بێ فیزو تەکەببور، بێ لەقەب و تایبەتمەندی.

**دووەم : کۆمەڵگای تاغوتی** : واتە کۆمەڵگای پلە پلە، کۆمەڵگای سیلسیلە و مەراتیب و ئیمتیازات، واتە کۆمەڵگای لەقەب و مەدالیا، کۆمەڵگای ماقوڵ و ناماقوڵ و ئەشرافی، کۆمەڵگای هەژار و دەوڵەمەند.

**سێیەم : ئیمان (باوەڕ)** : بریتیە لە دوو پایە (ڕوکن) :

١) پەیدابوونی مەعریفەت و ناسینی دروست نیسبەت بە ئصوڵی گەورەی بیروباوەڕی ئیسلامی.

٢) بەجێ هێنان و هەماهەنگ بوونی کەسایەتی ئینسان لەگەڵ ئەو مەعریفەت و ناسینەدا کە هەیەتی لەبەرامبەر بیروباوەڕی ئیسلامیەوە.

واتە : شوێن کەوتن و هەماهەنگ بوونی ئاوات و ئارەزووەکانی بەپێی ئەو مەعریفە و ناسینەی کە هەڵی گرتووە و بڕوای پێیەتی.

**کەواتە (باوەڕدار)** کەسێکە قبوڵی حەقی کردووە و خۆشی دەوێ و تەسلیمە بەسەرجەم پەیامەکانی و بەهۆیانەوە دڵ و گیانی گەشەو نەشونما پێ دەکات و تا ئاستی (لە پێناو دانانی تەواوی بەرژەوەندییە دروستەکانی و تەنانەت گیان بەخشینیشی) بەرگرییان لێ دەکات.

---

(١) (دەروازەیەك بۆ خەباتێکی نەناسێنراو– سەروەت عبدالله / ل ١٧١ ـ ١٧٢) .

**چوارەم : کوفر (بێ باوەڕی)** : بریتیە لە دوو پایە (ڕوکن) :

١) پەیدابوونی مەعریفەت و ناسینی دروست نیسبەت بە ئصولی گەورەی بیروباوەڕی ئیسلامی.

٢) بەجێ نەهێنان و هەماهەنگ نەبوونی کەسایەتی ئینسان لەگەڵ ئەو مەعریفەت و ناسینەدا کە هەیەتی لەبەرامبەر بیروباوەڕی ئیسلامیەوە.

**کەواتە (بێ باوەڕ)** کەسێکە قبوڵی حەقی نەکردووە و تەسلیم نەبووە پێی و ، بەتەواویش حەققی بۆ ڕۆشن بۆتەوە و ناشیەوێ کەس بیناسێ و لێی نزیك بێتەوە و هەموو هەوڵەکانیشی بۆ لەباربردن و دژایەتی کردنیەتی.

**پێنجەم : مونافیق (دووڕوو)** : بریتیە لە سێ پایە (ڕوکن) :

١) پەیدابوونی مەعریفەت و ناسینی دروست نیسبەت بە ئصولی گەورەی بیروباوەڕی ئیسلامی.

٢) بەجێ نەهێنان و هەماهەنگ نەبوونی کەسایەتی ئینسان لەگەڵ ئەو مەعریفەت و ناسینەدا کە هەیەتی لەبەرامبەر بیروباوەڕی ئیسلامیەوە.

٣) لە ڕووکەش و ڕوخساردا کردار و ڕەفتاری موسوڵمانانە ئەنجام دەدا و خۆی وەك ئەوان نیشان دەدات.

**کەواتە (مونافیق)** بریتیە لەوکەسەی کە بەتەواوی حەققی بۆ ڕۆشن بۆتەوە و، لە دڵ و دەروونیدا ڕقی لێی دەبێتەوە و تەسلیمی نابێ و، وە لە ڕووکەش و ڕوخسار و نواندنیدا موسوڵمانانە ڕەفتار دەکات.

**شەشەم : (ئیسلام) و (موسوڵمان) :**

(ئیسلام) یش دوو پێناسەی هەیە :

١) پەیدابوونی ئیمان و کردەوەی چاکە (کە ئەمە پێی دەوترێ : موسوڵمان) .

٢) تـەنها خـاوەنی کـردەوەی چـاکە بێـت (کـە ئەمـە دەبێتـە سـیفەتی مرۆڤـی مونافیق) .

واتــە: مەعریفــەت و ناسـینی بــە بیروبـاوەڕی ئیسـلامی هەیـە، بــەڵام خـۆی هەماهەنگ نەکردووە لەگەڵیدا و، تەنها کردەوەی چاکە ئەنجام دەدات.

**حەوتەم : ئەهلی فەترە :** ئەوەیـە وا هێشـتا تـەواو حـەقق و پـەیامی خـوایی بـۆ ڕۆشن نەکراوەتەوە و هێشتا بە جوانی و دروستی نازانـێ وەحـی ئیلاهـی و پـەیامی ئایین چیە و چۆنە و چیشیان لەو داوایە ؟

لەبەر ئەوە بە ئارەزووی خۆیان یان بوونەتە گاور ، یان جوولەکـە، یـان لەسـەر داب و نەریتی باوو باپیریان لەسەر بت پەرستی و هاوبەش پەیداکردن ماونەتەوە..

### ٨) کاك ئەحمەد و هەستی نیشتمان پەروەری :

(کاك ئەحمەد) لـە سـاڵەکانی (پـەنجا) و (شەسـتەکان) دا کەسـێکی نیشـتمان پەروەر و ئازادی خواز بووە و، هەمیشـە حـەزی بـە ڕزگـاری میللەتەکـەی کـردووە، بـەپێی هەنـدێ زانیـاری کاتـێ لـە (تەوێڵـە) بـووە لەگـەڵ چـەند هاوڕێیـەکی تریـدا حیزبێکی سیاسییان دامەزرانـدووە بـە نـاوی (شـۆڕش) ، پـاش ماوەیـەك حیزبەکـە هەڵوەشـاوەتەوە و، دواتـر هاوکـاری (حیزبـی دیمـوکراتی کوردسـتانی ئێـران) ی کردووە، کە لەو کاتەدا تەنها حیزبێك بووە کە تێکۆشـان و جووڵانـەوەی وای بـووە کـە بـۆ کـورد هـەوڵ بـدات و ، هـەروەها دژی ئـایینی ئیسـلام و داب و نـەریتی لـە مێژینەی کوردەواریش نەبێت. هـەر بۆیـە (کـاك ئەحمـەد) ی ئـازادی خـواز دەبێتـە ئەندامی چالاکی ئەم حیزبە و، دواتر دەبێتە سەرۆکی (کۆمیتەی تاران) [1] .

---

(١) (چـپ در ایـران / ل ٢٢٩) ، و (ژیاننامــەی زانـای گـەورەی کوردســتان مامۆسـتا ناصـری سوبحانی ـ ئامادەکردنی: عبدالله عبدالعزیز عەبدی / ل ١٦٣) .

لێرەدا (کاك ئەحمەد) بۆمان دەگێڕێتەوە و دەفەرموێ : لە کۆتایی ساڵی (١٣٤٢) ی کۆچی هەتاوی بوو لە تاران سەرۆکی (حیزبی دیموکراتی تاران) بووم، کۆمیتەیەك بوو لە تاران من سەرۆکی ئەو کۆمیتەیە بووم، تا ئەو ئەندازەیە چالاك بووم بۆ حیزبی دیموکرات، جگە لەوەی لەو کاتەدا، لەگەڵ ژمارەیەك لە کوردەکان ڕۆژنامەی (کوردستان) مان دەردەکرد، هەروەها لە ڕادیۆی (کوردی تاران) یش کارم دەکرد کە مەتاڵێك هەبوو ڕوونم دەکردنەوە[1].

سەرەنجام لە ساڵی (١٣٤١) ی کۆچی هەتاویدا بە تۆمەتی ئەندام بوون لەو حیزبەدا و لێپرسراوی یەکەمی ئەو حیزبە لە تاران خۆی و نزیکەی (١٢٠) کەس لە کوردە (ناسیۆنالیستەکان) ی تاران، کە خەریکی کارو چالاکی نەتەوایەتی بوون دەستگیر دەکرێن و دەخرێنە زیندانی ترسناکی (ئەوین) لە تاران.

بەڵام پاش ماوەیەك لە زیندان (کاك ئەحمەد) بەم ئاکامە دەگات : کە ڕزگاری گەلی کورد بەبێ باوەڕی دینی بە دەست نایە و سەرناگرێت ، چونکە کێ دەڵێ ئەگەر وڵات و گەلیان ڕزگار کرد و هێزیان پەیدا کرد ، ئەمانیش وەکو داگیرکەران و ماف خۆرانی پێشوو خراپتر نابن.

وەك دەفەرموێ :

گورگێکی ناسراو تەفرو تونابوو   بۆ گورگێکی تر سەر ئەخەوێنن

وە لە بارەی نیشتمان پەروەریەوە (کاك ئەحمەد) هۆنراوەیەکی درێژی داناوە بەناوی (لافاوی داخ) هەر بۆیە پێمان خۆشبوو ئەو هۆنراوەیە بخەینە بەر دیدی خوێنەران:

---

(١) لە کاسێتی (ئەمانەت) وەرگیراوە، ئەم کاسێتە بریتیە لە وتارێکی (کاك ئەحمەد) لەبارەی ئەمانەتداریەوە.

## لافـــــــاوی داخ

دێســـان خەیاڵی دەردی گرانی گـــەل و وڵات
لافـــاوی داخی ڕشتە کـــەلاوەی دڵی کڵـــۆڵ

داخی وڵاتــە لەتلەتەکەی لاشە پڕ لەداخ
زۆخاوی دەردی میللەتی داماوی خەم لە کۆڵ

ئەو نیشتمانە بێ کەسە ، وەك ماڵی ئازیـەتی
ژورودەری هـەرایـە لـە هـــاواری ڕۆڵـــە ڕۆ

وەك بـــاخێ پەڵەیکی کەوێتە دەســی دزێ
مێراتییێ کە بەشبەری ، شەڕیانە خۆ بە خۆ

ئەو خەڵکە وا ڕەتاو و شەل پەت بوە ئـــەڵێی
ڕانێکە تێ ڕژاوە لە هەر لاوە گورگـــــەلی

خۆی ژێر چە پۆکێ دایکە دەردانێ بەر پەلێ
ماڵێ ، لەشێ لەبەر پەلی هەر دڕنەیێ پەلێ

کۆسار و دەشتی ، گوڵگوڵی خوێنی جحێڵ و پیر
دێهات و شاری ، دڵ پڕە هاواری دایك و بـــاب

ترســـاوە شـێنی بێدە منداڵی باب کـوژراو
وەختــە کــە جەرگی یەدێدیش ئەکا کەباب

ئاخ خوێنە وارە خواری زك و دەســـتە ڵانەکان
هەندێکی سە ر بە گۆدە لە بڕێ سەر بە مێزمرە

ئەم گشتە دەردی خەڵك و وڵاتــە لە ئێوەیە
هەر بۆ خوە تانە هەرچێ تەقالاو سەرو دەردە

یەك هەڵ ئەنێ بە مەرحەمەت و عەدڵی زاڵما
یەك هەڵ ئەنێ بەرەو هەڵەتی مەرگێ لاوەکان

ئەو بەشکە خوان و کوانوی بگرێت و پڕکرێ
ئەم بۆ بەشێ لە دەست و بڕۆی ئاوکو تاوەکان

ئەی خوایە ئەو خەمانە هەمۆ لایێ، لایێ تر
خۆم شەرمەزاری دینی تۆ و بەنـدە کاتی تـۆ
ڕێ تۆم ئەگەر بە جوانێ بـدایە نیشـانی خەلك
نـە ڕاوی ڕێـوێ و نـە لـە بۆ گورگ بۆن گرۆ
تەنیا ئەگەر لە دوو کەلیمەی دینـی تۆ، گەلم
کردایـە شـارەزا نە ئـەبۆن وائێنـە دەردەدار
خـوا هەر یەکێکە، ملکزی لای غەیری خوا مەبن
ڕێ کفرە: چەندێ سەرمەس و ماقۆلێ گەلی هەژار
خوایە خەجـاڵەتی دلێ قـرچـاوی مللەتـم
هێ خەڵکی دیل و ملکـزی بـەردەسـتی زاڵمـان
ئـازانە نـەمبری کـەلی ( انـذر عشـیرتـك )
تـاوا گەلـم لـە پەل و تەڵەکە و زۆر نـەبێ بەران
ئەی خوایە خـۆت ئەزانی خـەیاڵێ خەیانەتم
هەرگیز نەبۆ نـە بـۆ گەلی خوم نە دینی تـۆ
بـم بـەخشـە: خـوم و هاوڕێەکانم بتـەوکە ، وا
ئـەو خـەڵکـە موخلیسـانە لەڕێ تۆ بخەینە خۆ
چوار ڕۆژی عەیش و نۆشی هەوارگەی نەفام بەزێن
بۆ مـولکی بێ زەواڵی ڕەزای تـۆ فـدا بکـەیـن
هەم خۆ بە بەختی بەختەوەران شوێنی وان کەوین
هەم خەڵکـی وێڵێ بەختەوەری هـەردولا بکـەیـن

(کاک ئەحمەد) لە کتێبی (**دربارەی کردستان**) دا کە دوای سەرکەوتنی شۆڕشی خەڵکی موسوڵمانی ئێران نوسیویەتی ، دەفەرموێ : تەنیا هۆی چارە ڕەشیەکانی موسوڵمانان دوور کەوتنەوەیان لە (قورئان) بوو ، ئێستاکەیش تەنیا هۆکاری هۆشیار بوونەوە و بەختەوەری و ڕزگاری موسوڵمانان ، وە نەجاتیان لە بەند و زنجیری کۆیلەیی دنیاخۆران و داوەکانی هەڵخەڵەتاندنیان ، هەر گەڕانەوەیە بۆلای (قورئان) ، بێجگە لەمە ڕێگەیەکی دروست و سەر ڕاست نیە.




### ٩) کاک ئەحمەد و گرتنەبەری ڕێی بانگەواز :

مامۆستا (بورهان محمد ئەمین) [1] کە یەکێکە لە دۆستە نزیکەکانی (کاک ئەحمەد) و ساڵانێ لە خزمەتیدا ژیاوە دەڵێ : جارێکیان لە (کاک ئەحمەد) م پرسی: ئەم ڕێبازی ئێستات چۆن گرتەبەر؟

فەرمووی: لە کاتی زیندانی کردندا بووم شەوێك خەونێکی سەیرم بینی: بە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) گەیشتم، ئەو تەشریفی دانیشتبوو، منیش وەکو منداڵێکی تەمەن حەوت هەشت ساڵان دەستم خستبووە سەرشانی پیرۆزی، ئەویش قورئانێکی بە دەستەوە بوو، هەوڵی دەدا قورئانم بە وردی فێر بکات.. چەند ئایەت

---

(١) خاوەنی (تەفسیری ئاسان) .

و سورەتێکی پێ وتم، ختوپڕ خەبەرم بووەوە، خەوم زڕا، هەستم بە گۆڕانێکی زۆر دەکرد لە دڵ و دەروونمدا، ئەسرین لە چاوانم باری، لە دڵی خۆمدا دەموت: ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە من شارەزاییم لە قورئان کاڵ و کرچ و کەمە، دەبێ لەمەودوا بە وردی سەرنجی بدەم و بیکەمە پەیامی ڕزگاریی بۆ گەلەکەم.

ئەو شەوەم بە شەونوێژ بەسەر بردو دیمەنی پێغەمبەرم (ﷺ) هەر لەبەر چاوان بوو، کاتێ قورئانم دەخوێند لە نوێژەکاندا دەتوت تازە دەیخوێنم و نەم خوێندووەتەوە و نەم بیستووە، دوایی کە ڕۆژ بۆوە هەوڵمدا قورئانێکم پەیدا کرد و دەستم کرد بە دەورکردنەوە و تێفکرین و ڕامان لە ئایەتەکان، دەم خوێندەوە، بیرم دەکردەوە لە فەرمانەکان تا چ ئاستێك من و ئەو خەڵکە پابەندین پێوەی ! !

هەستم کرد لە شوێنی ئایەتەکاندا کە مرۆڤایەتی بە درێژایی مێژوو گیرۆدەی دەستی ستەمکار و ملهوڕەکانە.

مرۆڤایەتی دوو دەستەی سەرەکیە لەلایەکەوە.. هەیانە ئیماندار و دەست و دڵپاك و خواناسە. هەشیانە بێ ئیمان و دڕندە و خوێنڕێژ و ناپاك، لەلایەکی تریشەوە دەستەیەکیان (مستكبر) و زاڵم و ستەمکار، دەستەیەکیش (مستضعف) و چەوساوە و لاواز و گەلەکەی منیش لەم دەستە دوانییە دەهاتە بەرچاو بۆیە بڕیارمدا هەر کە ئازاد کرام هەوڵبدەم بەم قورئانە گەلەکەم ڕزگار بکەم..





## ١٠) کاك ئەحمەد و سەفەری حەج :

کاك ئەحمەد لە ساڵەکانی حەفتاکاندا سەفەری حەجی بە نسیب بووە و چاوی ڕووناك بۆتەوە بە دیداری کەعبەی پیرۆز و خانەی خوا و، هەروەها شوێنی لەدایك بوونی سەرداری مرۆڤایەتی (محمدی خۆشەویست) و مەدینەی منەووەرە.







وێنەی کاك ئەحمەد لە عەرەفە و میناداً

**١١) هەوڵ و چالاكیە ئیسلامیەكانی (كاك ئەحمەد) لە پێش ڕاپەڕین و شۆڕشی گەلانی ئێراندا :**

(كاك ئەحمەد) دوای هەوڵ و تەقەللایەكی زۆر بە وانە وتنەوە لە ماڵی خۆی و مزگەوتدا و پێشكەش كردنی وتار و ئامۆژگاری لە موناسەبە ئایینی یەكاندا وەك : (مەولودنامە و ، كۆڕی سەرەخۆشی و ، .. هتد) دا ، دەست دەكات بە ڕوون كردنەوەی ئامانجەكانی ئیسلامی ڕاستەقینە و ، هەروەها ئاگادار كردنەوەی خەڵكی لە زوڵم و ستەمی حكومەت و درۆ و دەلەسەی زۆربەی ڕابەرانی ئاییني بە ناوی ئیسلامەوە ، بە تایبەت لە شاری سنە و مەریوان و دەوروبەریان ، كە ڕای گشتی زۆربەی خەڵك بەرەو خۆی ڕا دەكێشێ سەرەنجام هەندێ لاوو گەنجی كوڕ و كچ دەبنە لایەن گری.

شایانی باسە لە شارەكانی (سەقز) ، (بۆكان) ، (مەریوان) ، (پاوە) ، (جوانڕۆ) ، (كرماشان) ، (كامێران) یش هەندێ كەسایەتی ئازادی خواز و زانای ئاییني و شارەزا لە ئیسلام و دەردی گەلەكەیان دەبنە هۆگری (كاك ئەحمەد) ، كە هەندێكیان دێنێتە شاری سنە تا بە یارمەتی ئەوان پێگەیەكی بەهێزی ئاییني و ئازادی خواز دابمەزرێنێت ، سەرەتا لە بەهاری ساڵی (١٣٥٦) ی كۆچی هەتاویدا لە شاری مەریوان مەدرەسەیەكی قورئانی دامەزراند، پاش چەند مانگێك لە شاری سنەیش، كە بەم چەشنە هەوڵ و تێكۆشانە تەنیایی یەكەی بوو بە ئیشی كۆمەڵ و دەستە جەمعی، ساڵی دوایی لە شارەكانی (سەقز) و (بۆكان) یش مەدرەسەی قورئان دانرا ..




## ١٢) هەوڵ و تێکۆشان و دروشمی (کاك ئەحمەد) لە کاتی ڕاپەڕیندا،

هاوکات لەگەڵ ڕاپەڕین و خۆنیشاندان و دەربڕینی بێزاری خەڵکەکانی تری ئێران ، (کاك ئەحمەد) یش زۆر بە توندی و پتەوی هەر لەو مەدرەسانەی قورئانەوە ، خەڵکەکانی ماف خوراوو ستەم لێکراوی لە مێژینەی کورد و سوننی هەڵساند و خستنیە ڕێگە بۆ دەربڕینی ناڕەزایەتی و بێزاری.

(کاك ئەحمەد) بە سێ دروشمەوە دەستی پێکرد و تا مردنیش بەم دروشمانە بە ئەمەك و باوەڕدار بوو ، دروشمەکانیش ئەمانە بوون :

**یەکەم**: نەهێشتنی ستەمی نەتەوایەتی. **دووەم**: نەهێشتنی ستەمی مەزهەبی. **سێیەم**: نەهێشتنی ستەمی چینایەتی.

خەڵکی پاك و ساغیش هەرسێ دروشمەکەیان زۆر بەلاوە گرنگ و بە نرخ بوو ، هەر بۆیە لە ئاکامدا لە کۆتایی ساڵی (١٣٥٧) ی کۆچی هەتاویدا ڕاپەڕینەکە سەرکەوت، (کاك ئەحمەد) زۆر بە دڵپاکی و چالاکیەوە چووە بەرەوە تا بە ڕابەرانێ کە بوونەتە خاوەنی بەروبۆی ڕاپەڕینەکە بسەلمێنێ کە: بە سەرنجدان و پیادەکردنی ئەم سێ دروشمە، – نە بە وتەی پووچ !

**یەکەم**: ڕاپەڕینەکە دەبێتە ئیسلامی.

**دووەم:** گەلانی فراوانی جۆراو جۆری نەتەوایەتی و باوەڕی ئێران – چ ئیسلامی و چ غەیرە ئیسلامی – ڕاپەڕینەکە بەهی خۆیان دەزانن و دڵی پێ خۆش دەکەن و گیان فیدایی بۆ دەکەن.

**سێیەم:** دەبێتە سەرمەشق و سەرچاوە بۆ گەلان و موسوڵمانانی دیکەی دنیاش.

بەڵام بەداخەوە هیچکام لەم دروشمانە نەبوونە بنەما و بەرنامەی یاسا و هەڵسوڕانی بەڕێوەبەرانی ڕاپەڕین و حکومەتەکەی ! !، جا بۆیە (کاك ئەحمەد) زۆر بە داخ و خەفەت و ناهومێدیەوە لە یارمەتیدانیان دەستی هەڵگرت و گەڕاوە سەر بارودۆخ و، جووڵانەوەی پێش ڕاپەڕین ، لەم هەڵسوکەوتانەدا و، بەڕواڵەت ! بێ هێز بوون و تێکشکانەدا ، هەندێ لە خزمان و قوتابیانی نزیك و، بڕێکیش لە یاران و مۆکرانی ، لێی جیا بوونەوە و بەجێیان هێشت ! !















وێنەی جەماوەری ڕاپەڕیو و کاک ئەحمەدی موفتی زادە

**١٣) هەوڵ و تەقەللای (کاك ئەحمەد) بۆ هێنانەدی ئۆتۆنۆمی ئیسلامی (خودموختاری) بۆ کوردستانی ئێران:**

لە دوای بڵاوکردنـەوەی ئاگـاداری نامەیـەك لـە لایـەن (کـاك ئەحمـەد) ە وە لـە بەرواری (١٨ / ٣ / ١٣٥٨) بۆ هەموو کۆمەڵە و ڕێکخراوو حیزبە کوردستانیەکان بـۆ بەستنی کۆنگرەیەکی نیشتمانی لە شاری (سنە) بە مەبەستی هاوهەڵوێستی هەموو لایەك سـەبارەت بـە یـەکگرتوویی میللـەتی کـورد و داواکردنـی (خودموختـاری) بـۆ ناوچەکانی کورد نشین، کە ئەمەش دەقی بڵاوکراوەکەیە [1]:

---

(١) (دەروازەیەك بۆ خەباتێکی نەناسێنراو– سەروەت عبدالله / ل ٢٨١ ـ ٢٨٣) .

**بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان**

هاونیشتمانییە خۆشەویستەکان! ئەو گرفتاری و مەحرومەتیانەی میللەتی کورد لە زەمانی بەردەوام بوونی دەستەڵاتی ستەمکاری شاهەنشاهی لە کورشەوە تا ئاریان مهر تەحەممولی کردووە و بەرگری کردن و کۆششی ئەم میللەتە لە پێناوی لابردنی زوڵم و زۆر زیاتر لەوەیە وەسف بکرێت.

ئێستاش کە هەستانەوەی میللەتە موسڵمانەکانی ئێران بە بەرهەم گەیشتووە و لەجیاتی سیستەمی ستەمکاری شاهەنشاهی سیستەمی دادپەروەری جمهوری ئیسلامی جێگیربووە و لێپرسراوانی کۆمەڵگا لەبەرامبەر داواکارییەکانی میللەتی کورد، لەوانە پرۆژەی مافی خودموختاری، پشتگیری خۆیان دووپاتکردۆتەوە، هەر تاکە مرۆڤێکی وشیارو دڵسۆزی کورد بەرپرسیارە کە ئەوپەڕی تواناییەکانی خۆی لە ڕێگەی بەکارهێنانی دروست و سەرکەوتن و بۆ خۆشی و مسۆگەری ئایندەی میللەتی کورد بەکاربهێنێت.

ڕوون و ئاشکرایە، کە لەم جۆرە پرسانەدا تاکێك یان چەند کەسێکی میللەت حەقی بڕیاردانیان نیە، بەڵکو تەنها ڕێگەی لۆژیکی کۆبوونەوەی چەند تاکێکە لە هەموو گروپ و توێژە سیاسیە جیاوازەکان، تا لەم ڕێگەیەوە کۆمەڵێك بۆ نوێنەرایەتی هەڵبژێرن. ئەم کۆمەڵە پرۆپۆزەڵی پێویست بۆ وتوێژکردن لەگەڵ گەورە لێپرسراوانی میللەت ئامادە دەکەن، ئەوکەسانەی لەم ڕێگەیەوە هەڵدەبژێرین دەتوانن خۆیان بە نوێنەری میللەت بزانن، بە نوێنەری میللەت لە خەیرو خۆشی ئەواندا. بۆ هێنانەدی ئەم پرسە گرنگە و دروستکردنی ئەم جۆرە گروپە جارێك لە (سەقز) و جارێك لە (کرمانشان) هەوڵی بۆ درا، کە بەداخەوە هەندێك ڕووداو بوونە هۆی بە نەتیجە نەگەیشتنی کۆتا، بەڵام بەهەر حاڵ ناتوانرێت لەبەر هەندێك ڕووداو

چاوپۆشی بکرێت لەوەی مایەی ئازادی و خۆشگوزەرانی میللەتی کوردە.

بە ناچاری جارێکی تر لە بانگهێشت نامەیەکدا هەموو کەسایەتیە دڵسۆزەکانی کورد بانگهێشت کراوە، کەلە (۲۰) ی (خورداد) ی مانگی ئایندەدا ئامادەبن و پاش موناقەشە و لێکدانەوەی بیرو بۆچوونە جیاوازەکان و هەڵبژاردنی باشترینی ئەوان، کۆمەڵێك وەك نوێنەر هەڵبژێرین، بۆ ئەوەی باشترین پرۆپۆزەڵ بۆ هێنانەدی داواکارییە جۆراو جۆرەکانی میللەت، لەوانەش هێنانەدی مافی خودموختاری کوردستان لە چوارچێوەی جمهوری ئیسلامی ئێران بێتەدی و چاودێری بکرێت. بەم شێوەیە داوا لە هاونیشتیمانییە کوردە خۆشەویستەکان دەکەین، کە بەشداری بکەن و لە هەموو جۆرە کینە و ڕا جیاوازە تایبەتەکان خۆیان چاوپۆشی بکەن و بەرژەوەندی میللەتی کورد لەپێش هەموو تێبینیەکانی ترەوە ڕەچاو بکەن و لە کۆنفراسی ڕۆژی (۲۰) ی (خورداد) بەشداری بکەن.

بەشداربووان دەبێ لە کاتژمێر (۷:۳۰) ی سەر لەبەیانی (۲۰) ی (خورداد) لە مزگەوتی (جامیعە) ئامادەبن، شوێنی کۆبوونەوە و پێشوازی و حەسانەوە پێشتر ئامادە کراوە.

**وسلام علیکم ورحمة الله وبرکاته**

**براتان / ئەحمەدی موفتی زادە**

**۱۸ / ۳ / ۱۳۵۸**



وێنەی کاك ئەحمەد لەگەڵ مەلا محمدی ڕەبیعی

لە کۆنفراسی خودموختاری کوردستاندا

(کاك ئەحمەد) ئەم کۆنگرەیەی بەست، دواتر کۆنگرەکە گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە ڕاگەیەنراوێکی (١٥) خاڵی ڕابگەیەنن بە کورتی بریتی بوون لە [1]:

**یەکەم** : پێویستە مافی ئۆتۆنۆمی ئیسلامی بە شێوەی یاسایی و یەکسانی بە هەموو میللەتانی ئێران بدرێ و، یاسای بنەڕەتیش لەسەر ئەم ڕێسایە دابڕێژرێت.

**دووەم** : بۆ (شیعە) و (سوننی) دەستەواژەی کەمینە و زۆرینە بەکار نەبرێ.

**سێیەم** : بەپێی سروشتی ڕژێمی پێشوو کۆمەڵگەی ئێران بە کۆمەڵگەیێکی چینایەتی لە قەڵەم دراوە، هەوڵ بدرێ سیاسەتی کۆمەڵایەتی و ئابووری وڵات وا بێ کە جیاوازی بە چینایەتیەکان هەڵگیرێن.

**چوارەم** : پێشتر کوردستان لە ڕووی پیشەسازی و ئاوەدانی و پشتگیری ئابووریەوە ستەمی لێکراوە. پێویستە داهات یەکسان دابەش بکرێت.

**پێنجەم** : لەبەر ئەوەی حکومەت لە ئیسلامدا بریتیە لە شورا و هێزی یاسا دانەر، بۆیە ڕێگەی مسۆگەربوونی خودموختاری (ئۆتۆنۆمی) بریتیە لە پێکهێنانی

---

(١) (شەهیدی ئازادی بیرورا مامۆستا ناصری سوبحانی / ل ٤٩ ـ ٥١) .

(شورا خود موختارەکان) لە هەر ناوچەیەکدا، کە لە پالّیاندا هێزێکی جێ بەجێ کەرو ، هێزێکی قەزائی و، هێزێکی تری (دارایی) دیاری بکرێ . دواتر نوێنەری ئەمانە لە (شورای مەرکەزی) و (حکومەتی مەرکەزی) دا بەشداربن، بەپێی رێژەیەکی گونجاو لە هەر شوێنێ.

**شەشەم** : حکومەتە خود موختارەکان هەر شێوە جموجۆڵێکی جودایی خوازی فەرهەنگی، کۆمەلآیەتی، سیاسی و ئابووری مەحکوم دەکەن.

**حەوتەم** : حکومەتە خود موختارەکان مافی سوود وەرگرتن لە زمانی خۆیان هەیە.

**هەشتەم** : پۆلیسی ناوچە ئۆتۆنۆمیەکان بۆ ئاسایشی ناوخۆن و لە ژێر فەرمانی قەزائیدان، بەلآم سوپا بۆ روو بەروو بوونەوەی دەرەکییە و مافی نیە دەست وەرداتە کاروباری ناوخۆ.

**نۆیەم** : هەموو ناوچە ئۆتۆنۆمیەکان لە تایبەتمەندی پەیوەندیە نێونەتەوەییەکان، بەپێی رێژەی دانیشتوان، بەهرەمەند دەبن.

**دەیەم** : سنوری ناوچەی ئۆتۆنۆمی کوردستان، بەپێی خواست و ئیرادەی میللەت، بەبێ کەمترین سەپاندن دیاری دەکرێت.

**یانزەیەم** : دەوڵەتی کۆماری ئیسلامی ئێران، دەبێ هەموو ئەو بڕیارە پێشووانەی ئێران کە دژی نەتەوەی کورد دراون، هەڵوەشێنێتەوە.

**دوانزەیەم** : کەمینە مەزهەبی و نەتەوەییەکانی سنووری ناوچە ئۆتۆنۆمیەکان دەبێ دارای مافی تەواوی کار و باری فەرهەنگی و سیاسی و کۆمەلآیەتی و مەزهەبی خۆیان بن.

**سیانزەیەم** : پاش ئەم کۆنگرەیە، بۆ رێگری لە هەر جۆرە دووبەرەکییەك، کۆنگرەیەکی تر بگیرێ و، کەسانی تر کە لێرە بەشدار نەبوون بەشدار بکرێن.

**چواردەیەم :** ئەو نوێنەرانەی لەم کۆنگرەیەدا هەڵدەبژێردرێن هەوڵبدەن لەگەڵ کەسانی پسپۆڕ پلانێکی ورد و دوور بۆ ئۆتۆنۆمی کوردستان ئامادە بکەن.

**پانزەیەم :** ئەم بەیاننامە کۆتایی یە کە ڕۆژی سێ شەممە (٢٢ / ٣ / ١٣٥٨) هەتاوی لە دانیشتنی کۆتایی کۆنگرەدا (١٥) ماددە داڕێژراوە هەنگاوێکە بۆ هەڵگرتنی هەموو جۆرە ستەمەکان کە ساڵەهایە دژی گەلی کورد بەکار دەبرێن.

شایانی باسە لە بەستنی ئەم کۆنگرەیەدا کە هەوڵێك بوو بۆ یەکخستنی تواناکانی میللەتی کورد و داواکردنی (ئۆتۆنۆمی بۆکوردستانی ئێران) بەپێی ئەو زانیارانەی ڕۆژنامەی (کیهان) لە بەرواری (٢١ / ٣ / ١٣٥٨) بڵاویکردۆتەوە **ئەو لایەن و ڕێکخراوو حیزب و کەسایەتیانەی کە ئامادەی کۆنگرەکە بوون و لەگەڵ دەرئەنجامەکانیدا بوون بریتی بوون لە :**

١) گروپی عەدالەت ویستانی کوردستان.

٢) گروپی ئیسلامی نەصر.

٣) ئەنجومەنی ئیسلامی بازارەکانی سنە.

٤) ئەنجومەنی ئیسلامی (دانش اموزان) .

٥) ئەنجومەنی ئیسلامی گەنجان.

٦) ئەنجومەنی ئیسلامی خوێندکارانی زانکۆ.

هەروەها مامۆستا (ناصری سوبحانی) ش یەکێك بووە لەوکەسانەی کە بەشداری بەرچاوی تێدا کردووە و وتار و قسەی بووە.



کاک ناصری سوبحانی

**ئەو لایەن و ڕێکخراوو حیزب و کەسایەتیانەی کە ئامادەی کۆنگرەکە نەبوون بریتی بوون لە :**

١) سەید عیزالدین حسێنی (ئیمام جومعەی مەهاباد) .

٢) کۆمەڵەی مامۆستایانی کوردستان.

٣) کۆمەڵەی پارێزگاری لە ئازادی و ئینقلابی کوردستان.

٤) شورای هاوکاری کۆمەڵەکانی کوردستان.

٥) ڕێکخراوی چریکەکانی فیدای خلق شاخ کوردستان.

٦) ڕێکخراوی ئینقلابی زەحمەت کێشانی کوردستان.

٧) خوێندکارانی زانکۆ.

٨) خوێندکارانی پێشەنگ.

هەر چەندە بڕیاریش بووە خودی (دکتۆر عبدالرحمن قاسملۆ– حیزبی دیمۆکراتی کوردستانی ئێران) لەو کۆنگرەیەدا بەشداری بکات.




دکتۆر عبدالرحمن قاسملۆ          شێخ عزالدین حسێنی



لەلای ڕاستەوە ڕەفسەنجانی ، بەهەشتی ، تاڵەقانی ،

کاک ئەحمەدی موفتی زادە و محمد ڕەبیعی




کاک ئەحمەد لە دوو کۆبوونەوەی گشتیدا

**١٤) دامەزراندنی (حیزبی موساواتی ئیسلامی) :**

(کاک ئەحمەد) لە ساڵی (١٣٥٩) ی کۆچی هەتاوی دا (حیزبی موساواتی ئیسلامی) دامەزراند بەو مەبەستەی کە ببێتە هۆکارێك بۆ زیاتر ڕێکخستنی موسوڵمانی ئەهلی سوننەی ئێران و، وە ببێتە هۆکاری فراوان کردنی بانگەوازی ئیسلامی ، هەر بۆ ئەو مەبەستە پەیوەندی کرد بە هەموو مامۆستایان و موسوڵمانانی دڵسۆزی هەموو ناوچەکانی کوردستان، بەڵام سەد مەخابن بەهۆی کەمتەرخەمی و بەدەمەوە نەچوونی مامۆستایان و دۆستانی دەوروبەریەوە ئەم حیزبە ئیسلامیە شکستی هێنا و هەر زوو لەبەین چوو..

مامۆستا (عبدالقادر تەوحیدی) کە یەکێ بووە لەو مامۆستا خەمخۆرانەی کە لە دەوروبەری (پاوە) لەگەڵ (کاك ناصری سوبحانی) و چەند مامۆستایەکی تردا دەوری کاریگەریان هەبووە لە بانگەوازکردنی خەڵك بۆ ڕێبازی ئیسلام، بۆمان دەگێڕێتەوە و دەڵێ: ئەو بەرنامەیەی ئێمە دامان نابوو ئیخوانی بوون بەڵام لەدوای ئەوەی کە (کاك ئەحمەدی موفتی زادە) ئیعلانی (حیزبی مساواتی) کرد، ئێمە کە چەند حزبیمان بەلاوە دروست نەبوو کاتێ لەگەڵ (کاك ئەحمەدی موفتی زادە) کەوتینە گفتوگۆ (کاك ئەحمەد) ئەو بەرنامەی ئێمە کە بەرنامەی ئیخوان بوو پەسەند کرد، بەڵام وتی: کاتەکە کاتێکی شپرزە و ئەم بەرنامەش بۆ ئەم کاتەی ئێستا دیارە ئێمە دەبێت هەموو ئەو خەڵکە کۆکەینەوە و جا ئەوکاتە ئێوە ئەوان بەو بەرنامەی خۆتانە ڕێکبخەن، من و (رحمة الله عەلی پوری) سەردەشتی، کراین بە مەسئولی ڕێکخستنی ئەو حیزبە، ماوەی یانزە ڕۆژ ئێمە ئەوانەی کە (کاك ئەحمەدی موفتی زادە) ڕەوانەی دەکرد بۆلامان کە لە حیزبەکەدا ڕێکبخەین هیچکام حازر نەبوون مەسئولییەت قەبوڵ بکەن جا بۆیە بە (کاك ئەحمەد) مان ڕاگەیاند کە

وەزعەکە وایە و حیزبەکە سەرناگرێت، جا بۆیە وازمان لەو هێناو (مەدرەسە قورئان) ، کە پێشتربوو کرا بە (مەکتەب قورئان) ، واتە: بە فیکرەی ئیخوان و ناوی (مەکتەب قورئان) ئیشمان دەکرد و هەموومان بەیەك ناو بووین و قەراریشماندا جگە لە ناوی (مەکتەب قورئان) کەس ناوێکی تر نەهێنێت[1].

**١٥) هەوڵ و تێکۆشان بۆ دامەزراندنی (شورای مەرکەزی سوننەت) کە ناسراوبوو بە (شورای شەمس) :**

پاش ئەوەی هەوڵە دیبلۆماسیەکان لەگەڵ سەرانی شۆڕش بۆ بە دەمەوە هاتنی مافە نەتەوەیی و مەزهەبیەکانی نەتەوە و مەزهەبە کەمینەکانی ئێران بێ ئاکام بوو، ئەوە بوو (کاك ئەحمەدی موفتی زادە) بە هاوکاری هەندێ لە زانا و سەرکردەکانی ئەهلی سوننەت، وەك (مەولەوی عبدالعزیز مەلا زادە) [2] ڕابەری خەڵکی (سیستان و بلوجستان) و، هەندێ لە زانایانی ناوچە بەندەرییە سوننیەکان، کەوتنە بیری کۆکردنەوەی زانا و کەسایەتیە بە تواناکانی ئەهلی سوننەت (کە مامۆستا ناصر یەکێ بووە لەو زانایانە) ، بە مەبەستی کۆنگرەیەکی فراوان، تایبەت بە هەموو ناوچە سوننی نشینەکانی سەراسەری ئێران، هەر بۆ ئەو مەبەستە (کاك ئەحمەد) پەیامێکی ئاراستەی هەموو ئەهلی سوننەی ئێران کرد تا بەشداربن لە دامەزراندنی شورایەکی مەرکەزی بۆ ئەهلی سوننەی ئێران کە ئەمەش دەقی

---

(١) (گۆڤاری ڕێگای شەرع / ل ٦٦ ـ ٧١) .

(٢) (مەولەوی عبدالعزیز مەلازادە) لە ساڵی (١٢٩٥) کۆچی هەتاوی دا لە دایك بووە و، لە (٢١) ی مانگی (مرداد) ی ساڵی (١٣٦٦) ی کۆچی هەتاوی دا کۆچی دوایی کردووە.

بڵاوکراوەکەیە بە زمانی فارسی [(١)]:

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

﴿ وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ ۚ وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ﴾ (آل عمران / ١٠٤)

"عرب، خود را بنور مصطفی سوخت
چراغ مرده مشرق برافروخت
ولیکن آن خلافت، راه گم کرد
که: اول، مؤمنان را شاهی آموخت"
(اقبال لاهوری)

از زمانی که. به طفته شاعر آگاه: اقبال. حکومت شوری و دولت خلافت، راه گم کرد و سلطنت جای آن را گرفت ، انواع بدبختیها بسوی مسلمانان روی آورد، که"تفرق"معلوم مستقیم این انحراف و ریشه باقی دردها و"أم الأمراض" بود.

در قرون انحراف، مردانی بزرگوار با بذل تمام تلاش و توان و نیز با ایثار و فدا کردن جان علیه تمام بدبختیها و علیه ریشه آنها: تفرق، و علیه "علة العلل" همه: حکومتهای ضد شورای دانشمندان اسلامی، قیام کردند. اما ذات تفرق، همیشه حربههائی بدست خود کامگان داده که بوسیله آن از تأثیر مطلوب تلاش قیام کنندگان علیه تفرق و علیه ریشه و علت و علیه پیامد و معلولهای آن، جلوگیری کردهاند.

قیام با عظمت مردم با ایمان ایران، تا آنجا پیش رفت که به صورت انقلابی حکومتی، تخت یکی از حکومتهای خود کامه تاریخ را سرنگون ساخت.

امید چنان بود که این انقلاب با انداختن علة العلل در ایران بتواند راهش را

---

(١) لە سایتی (شورای مەرکەزی سوننەت) وەرگیراوە.

بسوی درمان دیگر دردها و ریشه همه: تفرق، ادامه دهد، تا در نهایت از مذاهب اسلامی و فرقه‌های مسلمان در ایران و سراسر جهان، دین واحد و امت واحده را باز سازد. اما از آنجا که: پس از کتاب و سنت تنها وسیله وحدت و رفع تفرق اجتماع اولی الأمر (شورای اهل رأی، یا اهل حل وعقد، یعنی: تمام دانشمندان اسلامی) است، و حکومت در دست گیرنده زمام انقلاب نتوانست شرایط اینچنین اجتماعی را . علیرغم آمادگی مشتاقانه همه دانشمندان اسلامی سراسر عالم . فراهم سازد.

انقلاب بجای پیشروی بسوی کارهای اساسی پس از طی اولین مرحله از حیات دچار "ارتجاع" و ناتوانی گردید و راهش از مسیر انقلابی که شعارهای ایام قیام تصویر میکرد منحرف شد. زیرا "کارنامه" این انقلاب بصورت قانونی اساسی درآورد که بجای ریشه کن کردن "تفرق" آنرا تثبیت کرد و با اصول متعدد نیز بر آن مهر " مشروعیت " زد! . کاری که حکومتهای ارتجاعی صلاحیت آنرا در خود نمیدیدند، و.....و....

از پیش از انقلاب ایام تشکیل مجلس"خبرگان"و نیز بهنگام فعالیت آن تلاش فراوان شد که " وارثان انقلاب " بینش اسلامی دردها را بشناسند و بدرمان آنها بپردازند. تنها دو نماینده حدود یك پنجم جمعیت ایران ( یعنی: پیروان سنت ) که از بلوچستان بودند باز بسیار کوشیدند که سایر نماینده‌ها را راضی کنند که لااقل تا حدی از شدت تفرقه اندازی اصل دوازدهمین قانون بکاهند.

اما متأسفانه قدرت پذیرش و حتی درك عمیق حقایق واقعیات در اکثریت نمایندگان تا حد لازم برای استمرار بخشیدن به حرکت انقلاب گرانقدر ملت ایران نبود. و مجموعا، قانونی تصوسب کردند که علاوه بر تفرقه اندازی از جهات مختلف دیگر نیز چندان ایراد و نقص دارد که بهیجوجه صلاحیت " کارنامه شدن" برای انقلاب ملت با ایمان و ایثارگر ایران را . که در طول ایام یکساله پیش از انقلابش همواره با " تکبیر" و سایر شعارهای نوید دهنده آینده‌ای اسلامی، به استقبال شهادت میرفت . ندارد.

و اکنون بر تمام مسلمانان آگاه ایرانی است، اعم از سنی و شیعی، که از سقوط انقلاب با عظمت خود یا عقیم ماندن آن جلوگیری کنند، و نگذارند که خونبهای دهها هزار شهید ابران و میلیونها و دهها میلیون شهید تاریخ اسلام و آمال ملت ایران و همه مسلمانان جهان فدای کوته‌بینی و تنگ نظری عده‌ای شود. و بطور خاص بر پیروان صادق سنت حضرت محمد . صلی الله علیه وسلم . است که . علاوه بر تلاش مشترك با تمام مسلمانان شیعی دلسوز اسلام بخاطر مستقیم گردانیدن راه انقلاب . بکوشند تا از استمرار حرکت ارتجاعی انقلاب، در جهت تفرق و اعمال هر گونه ستم نسبت به اهل سنت قاطعانه جلوگیری شود. بخصوص که پس از تصویب اصل ١٢ و سایر اصول تبعیض آمیز و تفرقه انداز قانون اساسی کم و بیش قولا و فعلا در اینجا و آنجا آثار سوء نیت مدافعان استمرار تفرق علیه اهل سنت بچشم می خورد، و اعدام مرحوم شهید شکوری، و توجیه‌های «حاکم شرع» صادر کننده حکم اعدام، نموداری رسمی و علنی از صدها و هزاران نمونه از این آثار است. و به حکم موازین سیاسی و اخلاقی اسلام، هر مسلمانی چه شیعی و چه سنی، بتواند علیه این جنایات و ستمها اقدامی بکند، ولی دریغ ورزد در بارگاه حساب الهی شریك جرم شناخته خواهد شد.

و با توجه به اي مسائل، و بنا به حکم «ما لا یتم الواجب المطلق الآ به، فهو واجب» – و بدون اجتماع و تبادل نظر و همفکری صاحب نظران اهل سنت، تصحیح قانون، و رفع هر گونه ستم دیگر از این مسلمانان، مقدرور نیست . خود را مکلف دیدیم که مرکزی برای تشکیل چنین اجتماعاتی در تهران فراهم آوریم تا با شرکت همه دلسوزان مسلمانان سنی، شورایی از افراد واجد الشرایط تشکیل گردد.

هم اکنون با استقبال گرم و صمیمانه جمعی از جوانان با ایمان از اهل سنت مناطق مختلف ایران، تشکیلات «دفتر مرکزی» این شوری ترتیب یافته است.امیدوارم با توفیق و تایید خدای متعال، تلاش صمیمانه این جوانان بتواند بزودی به برگزاری اولین اجتماع بینجامد.

والسلام علینا و علی عباد الله الصالحین احمد مفتی زاده

تهران ١٣٥٩/١٢/٢٠



هەر بۆیە بانگێشتی زیاتر لە (٥٠٠) کەسایەتی و زانایان کرد و لە (تاران) کۆنگرەکە لە (١ / ٤) بۆ (٣ / ٤ / ١٩٨١ م) گرێ درا.. [1]



مەولەوی عبدالعزیز مەلازادە

دوای ئامادەبوونی نوێنەری ناوچەکانی ئێران، وەك (بەندەر عەباس و، سیستان و، بلوجستان و، کوردستان ..) بە ڕابەرایەتی (کاك ئەحمەد) و (مەولەوی عبدالعزیز) شورایەك دروستکرا، کە ئەندامانی باڵای ئەو شورایە پێکهاتبوو لە (١٠) نەفەر، کە خودی شورا (١١) کەس بوون، بەڵام هیچکام لە (کاك ئەحمەد) و (مەولەوی عبدالعزیز) نەبوونەتە ئەندامی باڵای شوراکە، جا بۆ زیاتر ئاشنابوون بە دامەزرێنەری شورای شەمس کەلەلایەن هەردوو سەرکردەی کۆچکردووەوە دامەزرا بە پێویستمان زانی کە

(١) (شەهیدی ئازادی بیروڕا مامۆستا ناصری سوبحانی / ل ٧٧ ـ ٧٨) .

کورتەیـەك لـە ژیاننامـەی ئـەو دوو سـەرکردەیە و تـەواوی ئەنـدامانی شـورای شـەمس بخەینە بەردیدی خوێنەران ، کە ئەویش بریتی بوون لە[1]:

(١) (کـاك ئەحمـەدی مـوفتی زادە دەروازەیـەك بـۆ خـەباتێکی نەناسـێنراو/ ل ١١٨ ــ ١١٩) و، سایتی (شورای مەرکەزی سوننەت) .

**یەکەم : کاك ئەحمەدی موفتی زادە :**




**ناو :** کاك ئەحمەدی موفتی زادە.

**مێژووی لە دایك بوون :** مانگی (بەهمەنی) ساڵی (١٣١١) کۆچی هەتاوی بەرامبەر (١٩٣٣) ی میلادی.

**شوێنی لە دایك بوون :** سنە – کوردستانی ئێران.

**پلەی زانستی :** ئیجازەی عیلمی و ، ئیجازەی فتوا و ئیجتیهاد.

**بەرپرسیاریەتی :**

١– دامەزرێنەری (مەکتەب قورئان) لە ساڵی (١٣٥٦) ی کۆچی هەتاوی.

٢– حاکم شەرعی کوردستان.

٣– ڕابەری ڕۆحی ئەهلی سوننەی کوردستان.

٤– دامەزرێنەری (حیزبی موساواتی ئیسلامی) لە ساڵی (١٣٥٩) ی کۆچی هەتاوی.

٥– یەکێکە لە دامەزرێنەرانی (شورای مەرکەزی سوننەت) لە ئێران.

**ماوەی زیندان کردنی :** (١٠) ساڵ.

**هۆی زیندانی کردنی :** پارێزگاری کردن لە مافی میللەتی کورد و سەرجەم

کەمە نەتەوایەتیەکانی تری ئێران و داواکردنی مافی هەژاران و کەم دەستان لە کاربەدەستانی وڵاتەکەی.

**مێژووی شەهیدبوونی :** (٢٠) ی (بەهمەنی) ساڵی (١٣٧١) ی کۆچی هەتاوی.

**دووەم : مەولەوی عبدالعزیز مەلازادە :**




**ناو :** مەولەوی عبدالعزیز مەلازادە.

**مێژووی لە دایك بوون :** ساڵی (١٢٩٥) ی کۆچی هەتاوی.

**شوێنی لە دایك بوون :** گوندی (دپکور) لە ناوچەی (سرباز) سەر بە هەرێمی (بلوجستان) .

**پلەی زانستی :** دەرچووی کۆلیژی (دارالعلوم) و خوێندنگای (ئەمینیەی دەهلی) لە هیندستان.

**بەرپرسیاریەتی :**

١- بۆ ماوەی (٢) ساڵ مامۆستا بووە لە خوێندنگای (صولتیە) لە (حیجاز) .

٢- دامەزرێنەر و مامۆستای قوتابخانەی (دار العلوم) لە زاهیدان لە هەرێمی (بلوجستان) .

٣- ڕابەری ڕۆحی ئەهلی سوننەی بلوجستان.

٤- دامەزرێنەری (حیزبی ئیتیحادی موسوڵمانان) .

٥- یەكێكە لە دامەزرێنەرانی (شورای مەركەزی سوننەت) لە ئێران.

**مێژووی كۆچی دوایی :** (٢١) ی (مەرداد) ی ساڵی (١٣٦٦) ی كۆچی هەتاوی.



**شارۆچكەی سرباز**

**سێیەم : كاك ناصری سوبحانی:**




**ناو :** كاك ناصری سوبحانی.

**مێژووی لە دایك بوون :** ساڵی (١٣٣٠) ی كۆچی هەتاوی.

**شوێنی لە دایك بوون :** گوندی (دوریسان) سەر بە قەزای (پاوە) ی پارێزگای (کرمانشان) .

**پلەی زانستی :** ئیجازەی عیلمی و ، ئیجازەی فتوا و ئیجتیهاد.

**بەرپرسیاریەتی :**

١- نوێنەری خەڵکی (کرمانشان) لە کۆنگرەی یەکەم و دووەمی (شورای شەمس) دا.

٢- دامەزرێنەری قوتابخانەی (زانستی ئایینی) لە گوندی (دوریسان) ی سەر بە قەزای (پاوە) .

٣- یەکێکە لە دامەزرێنەرانی (رابیطەی ئیسلامی کورد) .

٤- یەکێکە لە دامەزرێنەرانی (کۆمەڵەی لایەنگران لە حکومەتی قورئان) .

٥- ئەندامی باڵای (شورای مەرکەزی سوننەت) .

٦- موجتەهیدی سەردەم.

**ماوەی زیندان کردنی :** (٩) مانگ و چەند رۆژێك.

**مێژووی شەهیدبوونی :** (٢٨) ی ئەسفەندی ساڵی (١٣٦٨) ی کۆچی هەتاوی.

**چوارەم : مامۆستا مەلا (عبدالله محمد) :**




**ناو :** مەلا عبدالله محمدی.

**مێژووی لە دایك بوون :** ساڵی (١٢٩٦) ی کۆچی هەتاوی.

**شوێنی لە دایك بوون :** گوندی (سوتووی بەردەڕەش) سەر بە قەزای (بانە) .

**پلەی زانستی :** ئیجازەی عیلمی و ، ئیجازەی فتوا و وانەوتنەوە.

**بەرپرسیاریەتی :**

١- ئیمام جومعەی پێشووی شاری (سەقز) ی سەر بە پارێزگای (سنە) .

٢- نوێنەری خەڵکی شاری (سنە) لە ئەنجومەنی (خبرگان) .

٣- یەکێکە لە زانا بەناوبانگەکانی کوردستانی ئێران.

٤- ئەندامی باڵای (شورای مەرکەزی سوننەت) .

**مێژووی کۆچی دوایی :** (٦) ی مانگی (تیر) ی ساڵی (١٣٧٤) ی کۆچی هەتاوی.

**پێنجەم : مامۆستا (مەلا صاڵەح) خوسرەوی:**




**ناو :** مەلا صاڵەح خوسرەوی.

**مێژووی لە دایك بوون :** (٥) ی (مەرداد) ی ساڵی (١٣٠٠) ی كۆچی هەتاوی.

**شوێنی لە دایك بوون :** گوندی (زندان) سەر بە شاری (سنە) .

**پلەی زانستی :** ئیجازەی فتوا و وانەوتنەوە لەسەر مەزهەبی ئیمام شافیعی.

**بەرپرسیاریەتی :**

١- پێش نوێژی مزگەوتی (شێخ محمد ئاقا زەمان) لە (سنە) .

٢- یەكێكە لە زانا بەناوبانگەكانی كوردستانی ئێران.

٣- ئەندامی باڵای (شورای مەركەزی سوننەت) .

**مێژووی شەهیدبوونی :** (٢٤) ی (مەرداد) ی ساڵی (١٣٦٠) ی كۆچی هەتاوی.

**شەشەم : (شێخ عبدالعزیز) حسێنی :**




**ناو :** شێخ عبدالعزیز حسێنی.

**مێژووی لە دایك بوون :** نەزانراوە.

**شوێنی لە دایك بوون :** نەزانراوە.

**پلەی زانستی :** کەسێکی شارەزا و بە ئاگا بووە لە زانستە شەرعیەکاندا.

**بەرپرسیاریەتی :**

١- ئیمام جومعەی پێشووی شاری (قەصری شیرین) سەر بە پارێزگای (کرمانشان) .

٢- ئەندامی باڵای (شورای مەرکەزی سوننەت) .

**مێژووی کۆچی دوایی :** نەزانراوە.

**حەوتەم : (مەولەوی عبدالحمید) :**




**ناو :** مەولەوی عبدالحمید إسماعیل زهی.

**مێژووی لە دایك بوون :** ساڵی (١٣٢٦) ی کۆچی هەتاوی.

**شوێنی لە دایك بوون :** نەزانراوە.

**پلەی زانستی :** ئیجازەی فتوا و وانەوتنەوە.

**بەرپرسیاریەتی :**

١- ئێستا ئیمام جومعەی زاهیدانە لە (بلوچستان) .

٢- بەڕێوەبەر و مامۆستای قوتابخانەی (دار العلوم) ی زاهیدان لە (بلوچستان) .

٣- سەرۆکی (شورای هەماهەنگی قوتابخانە ئایینیەکانی ئەهلی سوننەت) لە پارێزگای (سیستان) و (بلوچستان) .

٤- ئەندامی باڵای (شورای مەرکەزی سوننەت) .

٥- ئەندامی (مجمع بین المللی) فیقهی ئیسلامی.

**هەشتەم : (مەولەوی عبدالملك مەلا زادە) :**




**ناو :** مەولەوی عبدالملك مەلازادە کوڕی مەولەوی عبدالعزیز.

**مێژووی لە دایك بوون :** ساڵی (١٣٢٨) ی کۆچی هەتاوی.

**شوێنی لە دایك بوون :** گوندی (حیط سربان) سەر بە شاری (ئێرانشەهر) لە ناوچەی (بلوچستان) .

**پلەی زانستی :** دەرچووی کۆلیژی (دەعوە و ئیرشاد) لە شاری مەدینەی منەوەرە لە عەرەبستانی سعودی.

**بەرپرسیارێتی :**

١- یەکێك بووە لە کادێرە بەرچاوو دیارەکانی (حیزبی ئیتیحادی موسوڵمانی) بلوچستان.

٢- دامەزرێنەری (ڕێکخراوی ئیسلامی محمدی) ئەهلی سوننەت.

٣- مامۆستای تێڕوانینی ئیسلامی و زمانی عەرەبی دواناوەندی (زاهیدان) ی سەر بە پارێزگای (بلوچستان) .

٤- ئەندامی باڵای (شورای مەرکەزی سوننەت) .

٥- سەرۆکی ئەنجومەنی باڵای ئەهلی سوننەتی ئێران.

**ماوەی زیندان کردنی :** (٦) مانگ.

**مێژووی شەهیدبوونی :** (١٤) ی (ئەسفەند) ی ساڵی (١٣٧٤) ی کۆچی هەتاوی، بەرامبەر (١٤) ی (شەوال) ی ساڵی (١٤١٦) هیجری.

**نۆیەم : (مەولەوی سەید محمد سعید فاضلی) :**




**ناو :** مەولەوی سەید محمدی کوڕی سەعیدی فاضلی.

**مێژووی لە دایك بوون :** (٧) ی (مهر) ی ساڵی (١٣٣٠) ی کۆچی هەتاوی.

**شوێنی لە دایك بوون :** (شەهر گزیك) سەر بە شاری (درمیان - أسدیە) ی پارێزگای (خوراسانی جنوبی) .

**پلەی زانستی :** ئیجازەی فتوا و وانەوتنەوە.

**بەرپرسیاریەتی :**

١- ئیمام جومعەی شاری (تایباد) سەر بە پارێزگای (خوراسان) .

٢- دامەزرێنەر و مامۆستای (حەوزەی عیلمی) زانکۆی ئەحنافی تایباد.

٣- دامەزرێنەری (شورای زانایان و ڕۆحانیەکانی) شاری تایباد.

٤- دامەزرێنەری یەکەم (دار الحفاظ القرآن الکریم) لە ناوچەی (خوراسان) .

٥- ئەندامی باڵای (شورای مەرکەزی سوننەت) .

٦- یەکێکە لە زانا بەناوبانگەکانی ناوچەی خوراسان.

٧- بناغەدانەری (دار العلوم تعلیم القرآن والسنة) لە ناوچەی خوراسان.

**ماوەی زیندان کردنی :** نەزانراوە.

**مێژووی شەهیدبوونی :** (٨) ی (ئەسفەند) ی ساڵی (١٣٨٣) ی کۆچی هەتاوی، بەرامبەر (١٤) ی (محرم) ی ساڵی (١٤٢٦) هیجری.

**دەیەم : مەولەوی عبدالعزیز الله یاری :**




**ناو :** مامۆستا عبدالعزیز الله یاری.

**مێژووی لە دایك بوون :** نەزانراوە.

**شوێنی لە دایك بوون :** نەزانراوە.

**پلەی زانستی :** ئیجازەی عیلمی.

**بەرپرسیاریەتی :**

١- ئیمام جومعەی شاری (بیرجند) ی سەر بە پارێزگای (خوراسان) .

٢- یەکێکە لە زانا بەناوبانگەکانی ناوچەی خوراسان.

٣- ئەندامی باڵای (شورای مەرکەزی سوننەت) .

**مێژووی شەهیدبوونی :** نەزانراوە.

**یانزەیەم : ماموستا نظر محمد دیدگاه :**




**ناو :** ماموستا نظر محمد دیدگاه.

**مێژووی لە دایك بوون :** ساڵی (١٣١١) ی کۆچی هەتاوی.

**شوێنی لە دایك بوون :** (کوران سفلی) ی خواروی (ئیرانشەهر) سەر بە ناوچەی (بلوچستان) .

**پلەی زانستی :** زانستە ئایینەکانی لە (پاکستان) خوێندووە و دیراسەی کردوون.

**بەرپرسیاریەتی :**

١- لە سەردەمی (شا) دا سەرۆکی (شورای شاری ئیرانشەهر) بووە.

٢- یەکێك بووە لە زانا بەناوبانگەکانی پارێزگای (سیستان) و (بلوچستان) .

٣- لە یەکەمین کۆبوونەوەی (ئەنجومەنی شورای ئیسلامی) نوێنەری شاری (ئیرانشەهر) بووە.

٤- تا نوێنەر بوو لە (ئەنجومەنی شورای ئیسلامی) ئیمام جومعە بوو.

٥- ئەندامی باڵای (شورای مەرکەزی سوننەت) .

**دوانزەیەم : مامۆستا مەولەوی شمس الدین مطهری :**




**ناو :** مامۆستا مەولەوی شمس الدین مطهری.

**مێژووی لە دایك بوون :** ساڵی (١٢٨٢) ی كۆچی هەتاوی.

**شوێنی لە دایك بوون :** گوندی (تیزاب) سەر بە ناوچەی (خواف) ی (خوراسان) .

**پلەی زانستی :** دەرچووی كۆلیژی (دار العلوم) ی دیوبەند لە وڵاتی (هندستان) .

**بەرپرسیاریەتی :**

١- یەكێكە لە زانا بەناوبانگەكانی ناوچەی (خوراسان) .

٢- بۆ ماوەی دوو ساڵ مامۆستا بووە لە یەكێ لە قوتابخانە ئایینیەكانی (شهر بریلی) لە هندستان.

٣- ئەندامی باڵای (شورای مەركەزی سوننەت) .

**مێژووی كۆچی دوایی :** (١١) ی مانگی (تیر) ی ساڵی (١٣٦٩) ی كۆچی هەتاوی.

شایانی باسە كۆنگرەی یەكەمی (شەمس) دوای سێ ڕۆژ كۆبوونەوە و گفتوگۆكردن كۆتایی هات و لە ڕۆژی (٣ / ٤ / ١٩٨١ م) دا بەلاغی كۆتایی كۆنگرە لە (١٦) خاڵدا نوسراو و بڵاوكرایەوە كە ئەویش بریتی بوو لە [1]:

(١) (هەمان سەرچاوەی پێشوو / ل ٣٦٩ ـ ٣٧١) .

**یەکەم** : بەپێی ناوەڕۆکی ناوخۆی کاتی (شورای ناوخۆی سوننەت) یەکەم کاری بریتیە لە هەوڵدان بۆ زیندووکردنەوەی ئوممەتی یەکگرتووی ئیسلامی، و وەلانانی دیمەن و دیاردەکانی دووبەرەکی لە نێوان ئەم ئوممەتەدا.

**دووەم** : هەوڵدان بۆ یەکڕیزکردنەوەی ئەهلی سوننەتی ئێران بەرەو یەکبوونی ئیسلامی.

**سێیەم** : پێکهێنانی شوراگەلی سەر بە شورای مەرکەزی سوننەت لە شارو ناوچە سوننی نشینەکاندا، لە کەسانی مەرجدار، تا ببنە ئەڵقەی پەیوەندی نێوان خەڵکی و شورای مەرکەز.

**چوارەم** : هەوڵدانی بەردەوام و سەرومڕ بۆ هەڵگرتنی ستەمی مەزهەبی و نەتەوایەتی و چینایەتی لە سەرانسەری ئێراندا لەسەر ئەهلی سوننەت، بەهۆی چاکسازی لە بنەما جۆراوجۆرەکانی یاسای بنەڕەتیدا، بە تایبەت بنەمای دوانزەهەم.

**پێنجەم** : کۆششکردن بۆ دامەزراندنی مەرکەزێك لە تاران – وەك مزگەوتێك – بۆ کۆبوونەوە و ڕێکخستنی بۆنەکان و خزمەتە ئایینیەکان، وەك نوێژی جومعە و جەماعەت و وتارخوێندن.

**شەشەم** : هەوڵدان بۆ دامەزراندن و بەهێزکردنی قوتابخانە ئایینیەکان لە تەواوی ناوچە سوننی نشینەکان، هەروەها کردنەوەی خولی کارگێڕی بۆ مامۆستایانی تەعلیمی ئایینی.

**حەوتەم** : پێکهێنانی دەستە و گروپی جۆراوجۆر، لە کەسانی بڕوادار و مولتەزیم بە ئاگایی و زانیاری گونجاوەوە، بە مەبەستی کاری تەبلیغات لە تەواوی ناوچەکانی ئەهلی سوننەتدا.

**هەشتەم** : ڕێکخستنی دەستەیەکی تایبەتی بە توانا بۆ نوسینەوەی تـەعلیماتی ئایینی قوتابخانەکانی ئەهلی سوننەت لە ئێراندا.

**نۆیەم** : هەوڵدان بۆ ڕێکخستنی بڵاوکراوەیـەکی هەمیشـەیی، کـە ڕەنگدانـەوەی داوا و ئاواتەکانی کۆمەڵگای ئەهلی سوننەت بێت.

**دەیەم** : هـەنگاونان بـۆ بەربەسـت دانـان لەبـەردەم سـوکایەتی و جنێـودان بـە گەورەکانی ئیسلام و، گونجاندنی لە یاسای بنەڕەتیدا.

**یانزەیەم** : هەوڵدان بۆ تایبەت کردنی چەند کاتژمێرێك لە شەوو ڕۆژدا، لە کـاتی پەخشی ڕادیۆو تەلەفزیۆنی سەرانسەری و خۆجێی، بۆ بەرنامەی تەبلیغاتی ئـایینی ئەهلی سوننەت، لەژێر چاودێری ئەم شورایەدا.

**دوانزەیەم** : دامەزراندنی پێش نوێژانی جومعە و حاکم شەرعییەکانی تەواوی ناوچە سوننیەکان، دەبێ بەپێی ڕای خەڵکی ناوچەکە، و پەسەندکردنی ئەم شورایە بێت.

**سـێانزەیەم** : هەوڵـدان بـۆ کۆکردنــەوە و خسـتنەگەڕی سـامان و داهـاتی موسـوڵمانانی ئـەهلی سـوننەت، لـە بـواری وەبـەرهێنان و خزمـەتی ناوچـەکانیان، بەمەبەستی بەرەو پێشبردنی ئامانجە ئیسلامییەکان.

**چواردەیەم** : هەوڵدان بۆ پەیوەندی کردن بە تەواوی موسوڵمانانی تری ئێـران و جیهانـەوە، بەمەبەسـتی تۆکمـەکردنی بناغـەی یـەکبوون و برایـەتی ئیسـلامی، بـە تایبـەت سـوود وەرگـرتن لـە هاوکـاری کەسـانی ئارەزوومەنـد بـە بەرنامـەی کـاری (شورای مەرکەزی سوننەت) .

**پانزەیـەم** : هەوڵـدان بـۆ نـاردنی کەسـانی بـەتوانا بـۆ ناوەنـدە ئیسـلامییە جیهانییەکان، بەمەبەستی وەرگرتن و فێربوونی زانست و زانیارییە ئیسلامییەکان.

**شانزەیەم** : بە پێی پێشنیار و پشتگیری تەواوی بەشدارانی ئـەم کۆبوونەوەیـە،

بڕیارەکانی (شورای مەرکەزی سوننە) ، دەبێ لەژێر چاودێری و بە ڕەزامەندی جەنابی زانای بەتوانا (کاك ئەحمەدی موفتی زادە) و جەنابی (مەولەوی عبدالعزیز) دا واژۆ بکرێن.



**ئارمی شورای مەرکەزی سوننەت**

**١٥) دانراوو نووسینەکانی :**

ئەو کتێبانەی کە بە زمانی فارسی نووسیونی بریتین لە :

١. **درباره کردستان** (بریتیە لەو نامە و بەیاننامانەی کە ئاڕاستەی سەرانی دەوڵەتی کردبوو دەربارەی کێشەی گەلی کورد) .
٢. **حکومت إسلامی.**
٣. **رسالە دربارە شورا.**
٤. **دین و إنسان.**
٥. **فطرت و هدایت.**
٦. **اهتمام بە شوری.**
٧. **پرورش و آموزش.**
٨. **مجموعە مقالات** (کە لە ڕۆژنامەکاندا بڵاوی کردونەتەوە) .
٩. **دیالکتیکی اسلامی.**
١٠. **نامەهای پراکندە.**

وە ئەو کتێبانەی کە بە زمانی کوردی نووسیونی بریتین لە :

**١. دیاریی بۆ یاران / بریتیە لە دیوانی شیعری كاك ئەحمەد (ئامادەكردنی : حەسەنی ئەمینی) .**

**٢. مەولودنامە.**

هەروەها (كاك ئەحمەد) خاوەنی چەند نامەیەكە كە بۆ (كاك فاروق فرساد) و (حەمەژیان) و دۆستانی نووسیونی كە بریتین لە :

**١. نامەی ژمارە یەك.**

**٢. نامەی ژمارە دوو.**

**٣. نامەی ژمارە سێ.**

**٤. نامەی ژمارە چوار.**

**٥. نامەی ژمارە پێنج.**

**٦. نامەی ژمارە شەش.**

**٧. نامەی ژمارە حەوت.**

**٨. نامەی ژمارە هەشت.**

**٩. نامەی ژمارە نۆ.**

**١٠. نامەی ژمارە دە.**

**١١. نامەی ژمارە یانزە.**

**١٢. نامەی ژمارە دوانزە.**

**١٣. نامەیەك بۆ كاك فاروق فرساد.**

**١٤. نامەیەك بۆ حەمەژیانی كوڕی.**



**وێنەی كاك ئەحمەد و كاك فاروق فرصاد**

